

ژمارە ٩

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

(شوبات) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات




- بەرنامەیەک بۆ پاراستنی فایلەکان.
- چۆنیەتی دابەشکردنی مۆسیقا لەبەرنامەی Cool Edit Pro.
- ٣٨ رێنمایی بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەر.

- ئایا راستە مایکرۆسۆفت سیخوری دەکات بەسەر بەکارهێنەرانی ویندۆز.
- ئەگەر ئیمێلەکەت دزرا چۆن جارێکی تر دەیگەڕێنیتەوە بەشێوەیەکی زۆر ئاسان.



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر - ٢٠٠٦

# هەنگاونان بۆ بەکوردی کردنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر

ئامادەکردنی : سەرنووسەر

aras_co_center@yahoo.com

خوێنەرانی بەڕێزی گۆڤاری کۆمپیوتەر باسی ئەم جارەمان تایبەتە بە پرۆژەیەکی هاوچەرخ بۆ بەرەو پێش بردنی زانستی کۆمپیوتەر لە کوردستانی خۆشەویستمان لێرەدا دەمەوێ بڵێم پیویستە ئێمەش ئەو هەنگاوە بنێن بۆ بە کوردی کردنی پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەر و بە تایبەتیش ئەو بەرنامە سەرەکیانەی کە رۆژانە خەلکی بەکاری دەهێنن بەڕێزان هەمووومان دەزانین ئێستا لە هەموو وڵاتێك بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر ئەو جۆرە سیستەمە هەڵدەبژێرن کە باشترین و سەرکەوتوترین سیستەم بێت کە تا ئێستاش سەرکەوتوترین سیستەم لە سیستەمەکانی کۆمپیوتەر کە زۆرترین بەکارهێنەری هەبێت سیستەمی Microsoft Windows ە و هەروەها ئەو پرۆگرامانەی کە تەواو کەری ئەو سیستەمەن کە بە بەشەکانی Microsoft Office ناسراوە ئەو سیستەم و بەرنامانەی کە تایبەتن بە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت ئێستا زۆربەی وولاتانی جیهان بەکاری دێنن و و زۆربەی ئەو وڵاتانە ئەو سیستەم و بەرنامانەیان بە هاوکاری کۆمپانیای مایکرۆسۆفت وەرگێراوەتە سەر زمانی خۆیان بۆ ئەوەی لەسەر کۆمپیوتەرەکانی خۆیان دایبنێن و هەر بە زمانی خۆیان بەکاری بێنن ئنجا لێرەدا دەمەوێ بڵێم با هەوڵدانی ئێمە بۆ ئەوە بێت بە شێوەیەکی گشتیی پرۆگرامە سەرەکیەکانی کۆمپیوتەر بکەینە زمانی شیرینی کوردی و بۆ ئەوەی کار ئاسانیەك بکەین بۆ هەموو تاکێکی ئەم کۆمەڵگایە و هەنگاوێکی پێشکەوتوو بنێن بۆ ئەو ئاراستەیە تا دواتر ئێمەش لە ناو کۆمەڵگاداجێ دەستمان دیار بێت وەك هەمیشە ئێمە لە کار و پێشکەوتن و زانست و ئەدەب و شارستانیەتدا جێگامان دیار بووە و تا ئێستاش ئێمە بەو توانا کەمەی کە لە بواری داراییدا هەمانە توانیومانە لە زۆر بواردا شان بە شانی گۆمەڵگاکانی تردا کار و چالاکی و دەرخستنی بەهرەکانمان دەر بخەین ئنجا ئێستا تەنها ئەوە ماوە بڵێم با بە پێی توانا و بێ ئەوەی بیر لە ماندوو بوون بکەینەوە لە هەولی ئەوە دابین بەرنامە سەرەتاییەکانی کۆمپیوتەر لە بەرنامە بچووکەکانەوە دەست پێ بکەین و تا دەگاتە سیستەم و بەرنامە بە هێزەکانی کۆمپیوتەر بکەینە کوردی هەرچەندە ئەو کارە هەوڵ و ماندوبوونێکی زۆری دەوێ و پشتگیریەکی حکومەتیشی دەوێ بۆ ئەوەی بتوانین لەگەڵ کۆمپانیای بەرهەمهێنەردا مامەڵە لە بارەی ئەو جۆرە پرۆژەیەدا بکەین کە ئێستا ئێمە هەندێ هەنگاوی جدیمان بۆ ئەو پرۆژەیە ناوە و بەردەوامین بۆ هەوڵدانیش تا دەگەینە مەبەستی خۆمان ئنجا ئەو بەڕێزانەی لە خۆیان رادەبینن بۆ ئەنجامدانی ئەو جۆرە پرۆژەیە دەتوانن پۆستێکمان بەو ناونیشانەی سەرەوە بۆ بنێرن و پێکەوە هەماهەنگی بکەین بۆ قسە کردن لەسەر ئەو پرۆژەیە و دواتریش ئەنجام دانی پرۆژەکە هیوادارم ئەو کەسانەی کە خەم خۆری زانست و پێش خستنی بواری رۆشنبیرین لە کوردستانی خۆشەویستمان هەر لە بەرپرسەکانی حکومیەوە تا دەگاتە ئەندازیارەکانی بواری کۆمپیوتەر و شارەزایانی ئەو بوارە با هەمووومان بە هەستێکی نەتەوەیی هەوڵ بۆ سەرکەوتنی ئەو پرۆژەیە بدەین و ببینە دەست پێشخەر بۆ بەدیهێنانی خەونی هەزاران کوردی هەر چوار پارچەی کوردستان و هەروەها بۆ سەلماندنی ئاستی زانستی و رۆشنبیری خۆمان با ئەو پرۆژەیە بکەینە مەشخەڵێك بۆ رووناك کردنەوەی رێگای زانست بۆ نەوەکانمان .

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە 9
شوباتی 2006

گۆڤارێکی مانگانەیە تایبەتە بە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت - وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات





چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە


تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت

## ناونیشان


هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیک هۆلی زەرد
بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێک دەربارەی گۆڤارەکە یان ناردنی بابەتێک . پەیوەندی بکەن
بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . بەڕیوەبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی
2527054 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی
Email : aras.co.center@yahoo.com


## تێبینی :

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر تکایە رەچاوی ڕێسای نووسین بکەن لەسەر کۆمپیوتەر بە دانانی خالبەندی نووسین بەم شێوەیەی لای خوارەوە

1- لە پێش فارزە ، هیچ Spase نەبێت لە دوای فارزەش با یەک Spase هەبێت .
2- لە پێش خاڵ . هیچ Spase نەبێت و لە دوای خاڵیش با دوو Spase هەبێت .
3- ئەو بەڕێزانەی کە بابەتی وەرگێڕان ئەنێرن با ئاماژە بە سەرچاوەکەی بکەن

# پێرست



Modify Text Control Window Help
Transform
Arrange
Frames
Group
Break Apart








Design View
Form Wizard
Chart Wizard
d automatically
our form, based on
you select.
table or query where
s data comes from:
tblAuthors
OK




# بەرنامەیەک بۆ پاراستنی فایلەکان




وێنەی (١)

بەناز عیرفان/ سلێمانی

تەکنەلۆژیای سەردەم گەیشتە ئەو ڕادەی کە بەشێکی زۆری ژیانی تایبەتی هەموو مرۆڤەکان بە ئەلیکترۆنیات بەستیتەوە تاکار گەیشتە ئەو ڕادەی تەواوی بازرگانی و گۆڕینەوەی نامەی نهێنی و چەندا هەواڵ و بابەت و فایلی گرنگ بگوازرینەوە، هەر لەرێگەی ئەنتەرنێتەوە، بەلام لە بەرامبەردا مەترسیەکی گەورە هەیە ئەویش بریتیە لە دزین و بردنی ئەو فایلانە لەلایەن خەڵکانی تر بەمەش دڵەراوکێیەکی زۆری لەناو بەکارهێنەرانی ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر دروست کردوە چونکە یەکێک لە تایبەتمەندیە خراپەکانی ئەنتەرنێت بریتیە لە لەدەست چونی زانیاریەکان واتە دوای ناردنی نامەکە یان فایلەکە ئەوا گەرانەوەی بۆ نیە . خۆ ئەگەر ناونیشانەکەت هەڵە دابو ئەوا تەواوی زانیاریەکەت لەدەست دەڕوا یان زۆرجار شوێن و سایتی هەڵخەتێنەر هەن بەمەش زانیاریەکان و فایلەکانت لەدەست دەچێت یان ئەگەر ئەم زانیاریانەت هەر لەناو کۆمپیوتەر بێت و حەز نەکەیت دەستی کەسی نەگاتێ ئەوا باشترین ڕێگە دانانی پاس ووردو پاراستنیانە بەشێوەیەکی ئەمنی توند بۆ ئەم مەبەستەش بەرنامەیەکی تایبەت هەیە بۆ تەشفیر کردنی فایلەکان واتە ئەم بەرنامەیە تەنها دەتوانێت فایلەکان بپارێزێت و تا وشەی نهێنی تایبەت بە خاوەنەکەی لێنەدات ئەم فایلە ناکرێتەوە واتا تا فایلەکە نەخەیتەوە

سـەر شێوەی ئاسـایی خۆی ناکرێتەوە. لەگەڵما بن تاکـو هەنگاوەکانی کارکردن لەم بەرنامەیە فێربین:

دوای دامەزراندنی بەرنامەکە کە لەناو سـیدی ئـەم گۆڤـارە دەسـت دەکەوێت ئـەوا راسـتەوخۆ دوو جێبەجێکار لەناو لیسـتی کلیکی راسـتی ماوس زیاد دەبن (بڕوانـە وێنـەی ١) جا بۆ ئـەوەی هەر فایلێـک یـان فایلەکانی هـەر فۆڵدەرێک تەشـفیر بکەین کە کەس بۆی نەکرێتەوە جگە لەخـۆت کە ژمارەی نهێنی دەزانیت ئەوا لەسـەر هـەر فایلێک کلیکی راسـت دەکەین دواتر (ENCRYPT) هەڵدەبژێرین و کلیکی لەسـەر دەکەین یەکسەر داوای دانانی ووشەی نهێنی دەکات، ووشەیەک بەئارەزوی خۆمان دەنوسین دواتر (OK) دەکەین دەبینن شێوەی فایلەکە دەگۆرێت بۆ شێوەی قفڵ و کلیل (بڕوانە وێنەی ٢) هەرکاتێک ویسـتت ئەم فایلانە بکەیتەوە کلیکـی راسـت دەکەیـت و (DECRYPT) هەڵدەبژێریت بەمەش فایلەکە دەگەڕێتەوە سـەر بـاری خـۆی ئینجـا دەتوانیـت بیکەیتەوە . بەمەش لەگەورەترین کێشـە رزگاریمان دەبێت ئەویش کەشـف بونی زانیاریەکانمانـە . بۆ زانیـاری زیاتریش ئـەم بەرنامەیە هەمـوو جۆرەکانی فایلی وێنـەی جولاوو نەجـولاو دەنگ و فایلی پەڕەکانی وێب و هەموو نوسینەکان قفل دەدات.




وێنەی (٢)




# بەرنامەی iTunes

ئا: مسعود شەقلاوەیی

بەرنامەی ITUNES بەڕاستی بەرنامەیەکی زۆر جوانەو توانایەکی بەهێزیشی هەیە لەبواری کار پێکردنی فایلی دەنگی ئەم بەرنامەیە بۆ لێدانی مۆسیقا یاخود گۆرانی دەنگ بەکاردێت هەروەک میدیا پلەیەر بەڵام کارئاسانی یەکی زۆری تێداکراوە یەکێک لەوانە کۆپیکردنی ئەو گۆرانیەی یاخود ئەودەنگەی کەتۆ مەستتە هەرلەناو ئەوبەرنامەیە هەروەها نیشاندانی جۆری گۆرانیەکە و نیشاندانی شوێنی ئەودەنگەی کەتۆ بەکاری دێنی هەروەها ڕیزکردنی گۆرانیەکان و بەشێوەی گەورەیی و بچوکی ناوەکان. بەکار هێنانی ئەم بەرنامەیە زۆرئاسانە بەرنامەکە دەکەیتەوە هەرچەند دەنگێکت هەبێت دەتوانی هەمویان بەیەکەوە ببەیتەناو ئەو بەرنامەیەو لەسەرەوە لەلای ڕاست شێوەی چاوێک هەیە ئەمەیان بۆکۆپیکردنی ئەو گۆرانیانەیە کەلەناو بەرنامەکە دا هەیە.

## زنجیرەی فێرکردنی بەرنامەی فۆتۆشۆپ

# ڕێکخستنەوەی ڕەنگەکانی وێنە

ئامادەکردنی: عەزیز ئەسعەد

بەرنامەی فۆتۆشۆپ یەکێک لەو بەرنامە پێش کەوتوانەیە کە بەهۆیەوە دەتوانرێ دەستکاری و گۆڕانکاری لەسەر وێنە بکرێ تا بتوانرێ ڕەنگەکانی وێنە بەشێوەیەکی جوانتر نیشان بدرێ، هەروەها توانای ئەوەمان پێ دەبەخشێ کە بتوانین وێنەکان بەشێوەیەکی ڕوونتر و گەشاوە تر ببینین.

بۆ دەست کەوتنی وێنەیەکی ڕوونتر و جوانتر بەرنامەی فۆتۆشۆپ ئەو سێ فەرمانەی خوارەوەمان پێش کەش دەکات کەڕاستەوخۆ کاردەکەن و پێویست بەوە ناکات هیچ فەرمانێکی تری لەگەڵ ئەنجام بدەین.

١- AUTO LEVELS .

٢- AUTO CONTRAST.

٣- AUTO COLOR.

وێنەیەک بکەرەوە کە ڕوونی ڕەنگەکانی کەم بێت وەک وێنەی (١) .

سێ نوسخەی تر لەوێنەکە دروست بکە . بۆ ئەم مەبەستەش فەرمانی IMAGE DUPLICATE هەڵبژێرە.

ئەم بۆکسەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە وەک وێنەی (٢) .

ئەم کردارە سێ جار دووبارە بکەرەوە. جاری یەکەم ناوی فایلە تازەکە بنێ (AUTO LEVELS) جاری دووەم ناوی (AUTO CONTRAST) بۆ فایلەکە دابنێ جاری سێ یەم ناوی (AUTO COLOR) بۆ فایلەکە دابنێ.

ئێستا چوار وێنەت لەبەر دەست دایە کە هەرچواری وەکو یەکە . دەتوانی لەسەر هەریەکەیان ئامرازی ڕێکخستنی وێنە ڕاستەوخۆ ئەنجام بدەیت .

بۆ ئەوەی بتوانی هەموو وێنەکان لەسەر شاشەکەت ببینی و بەهەمان قەبارە. وێنە سەرەکیەکەت هەڵبژێرە و بەهۆی فەرمانی ZOOM OUT VIEW یان (CTRL) لەگەڵ (-) وێنەکە بچووک بکەرەوە و، وا بکە چارەکی شاشەکە بگرێ.




وێنەی (١)




پاشان بەهۆی فەرمانی WINDOW TILE دەتوانی هەموو وێنەکان بەهەمان قەبارە ببینیت.

وە ئەگەر حەزت کرد کە هەموو سەندوق و شەریتی ئامرازەکان دابخەیت کلیلی (TAB) دابگرە، وە بۆ گەڕانەوەیان جارێکی تر دووبارە هەمان کلیلی (TAB) دابگرە.




وێنەی (٢)

پاشان ئەم کردارانەی خوارەوە ئەنجام بدە:

١- کلیک لەسەر وێنەی (AUTO LEVELS) بکە بۆ کارکردن لەسەری لەدواییدا فەرمانی :

IMAGE ADJASTMENT AUTO LEVELS هەڵبژێرەو ڕاستەوخۆ بەرنامەی فۆتۆشۆپ دەست دەکات بە چاکردنەوەی وێنەکەو تەماشای ئەنجامی فەرمانەکە بکە . وێنەی (٣) .

٢- کلیک لەسەر وێنەی (AUTO CONTRAST) بکە بۆ کارکردن لەسەری لەدواییدا فەرمانی :

IMAGE ADJASTMENT AUTO CONTRAST هەڵبژێرەو تەماشای ئەنجامی فەرمانەکە بکە ئێستا وێنەکە ڕووناکترو ڕوون تر بەرچاو دەکەوێ . وێنەی (٤) .

٣- کلیک لەسەر وێنەی (AUTO COLOR) بکە بۆ کارکردن لەسەری لەدواییدا فەرمانی :

IMAGE ADJASTMENT AUTO COLOR هەڵبژێرە دەبینیت هاوسەنگیەک لەنێوان ڕەنگەکانی وێنەکە دروست دەبێ، وێنەی (٥) .

ئێستا چەند وێنەیەکی تازەت دەست کەوت کە دەتوانی ئەو وێنەیە هەڵبژێری کە ڕەنگەکانی جوانترو باوەڕ پێکراو ترە، بەلام ئەگەر هەر بە ئەنجامەکانت ڕازی نەبوویت، دەتوانی شێوەیەکی تری مام

وێنەی (٣)




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)

ناوەندی هەڵبژێریت و دوان لەهەریەک لەم کردارانە بەیەکەوە تێکەڵ بکەیت بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- وێنەی AUTO COLOR بکەرەوەو فـەرمـانـی IMAGE APPLY IMAGE هەڵبژێرەو ئەم بۆکسەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە، وێنەی (٦) .

٢- کلیک لـەسـەر لیستی SOURCE بکەو AUTO LEVELS هەڵبژێرە، ئەم کردارەش کاریگەری AUTO LEVELS و AUTO COLOR تێکەڵ دەکات.

٣- لەلیستی BLENDING تێکەڵ کردنی NORMAL هەڵبژێرە .

٤- ڕێژەی OPACITY بگۆرە بۆ ٦٠٪ .

لەپاشن OK بکە ئەنجامی تێکەڵاو کردنی دوو وێنەکە دەبینیت . ئێستا دەتوانی وێنە کۆتاییەکە کۆگە بکەیت.




وێنەی (٦)




## ئا:دەشتی رەمەزان

ئەم بەرنامەیە لەبواری ئەنتەر نێت دا سودێکی زۆری لێوەردەگیرێت بەتایبەتی ئەوانەی کەدەیانەوێ شت لەئەنتەرنێت داونلۆد کەن لەبەرئەوەی سایتەکانی ئەنتەرنێت یەکجار زۆرن گەران بەدوایاندا کاتێکی زۆر دەخایەنێت ئێمەش ئەورۆ کەبەراستی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بۆهەموومان نارەخسێت کە بەهەرزان لەسەرمان بوەستێت لەبەرئەوە ناچارین پشت بەبەرنامەیەک ببەستین بۆ ئەوەی کارئاسانیمان بۆبکات واتا کات زۆر نەکوژێت و سودیشی هەبێت ئەم بەرنامەیە زۆرگرنگە ئەگەر بێت و تۆ سایتێکی ئەنتەر نێت بکەیتەوە تونازانیت ئەم سایتە چەند داونلۆدی تێدایە بەلام بەرنامەی FDMSNT بۆت دیاری دەکات کەچەند داوون لۆدی تێدایە ئینجا چ لەبواری مۆزیک بێت یاخود لەبواری بەرنامەبێت یان لەبواری ڤیدیۆ بێت هەر کام بابەت هەڵبژێریت لەم بوارە شتەکان دێنێتە بەردەستت، چۆن ؟ سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەر دێیت بەرنامەکە دەکەیتەوە لەسەرەوە لەلای چەپ هێمای (کو + ) دیارە کلیکێکی لەسەردەکەیت ئەم لیستە دەبێتەوە (وێنە ١) ئینجا لەم لیستە چوار بۆشایی دیارە لەبۆشاییەکەی سەرەوە HTTP:// لەتەنیش ئەم نووسینە ناوی ئەو سایتە دەنووسی کەشتی پیویستت لەناو ئەوسایتەیە بۆ نمونە ئەگەر من بەرنامە دژە ڤایرۆسی AVG م بوێت دەنووسم AVG.COM ئینجا بۆشایی دووەم کە SAVE FILE ی لەناودانووسراوە ئەوەبۆئەوە کەپێت دەڵێت دەتەوێ داونلۆدەکە هەڵبگرێت لەناوکۆمپیوتەر هەروەک خۆی لێیدەگەرێیت دێینە سەر بۆشایی سێیەم کە OTHER تێیدا نوسراوە ئەگەربێین بەماوس کلیکی لەسەربکەن دەبینین کەلیستێک دەبێتەوە کە MUSIC __ SOFTWARE__OTHER__VIDEO ی تێیدا نووسراوە ئینجا یەکێک لەم بابەتانە بەکەیفی خۆت هەڵدەبژێریت ئینجا OK دەکەیت چاوەرێدەکەیت هەرداونلۆدێک لەم سایتە هەبێت دێتە بەرچاوو و لەناو هاردی سی خەزن دەبێت.

# زنجیرەی فێربوونی بەرنامەی ئەکسیس

ئا: ڕێبوار نوری سعید



وێنەی (١)



وێنەی (٢)

ڕێگای سێیەم: دروستکردنی فۆرم بەڕێگای FORM WIZARD بەبەکارهێنانی یەک سەرچاوەی داتا یان زیاتر (خشتە یان کویری).

لێرەدا هەردوو خشتەی TBLAUTHORS و TBLBOOKS بەکاردێنین، بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە لە بەشی پێشوو پەیوەندیمان لەنێوان هەردووخشتەی سەرەوە دروست کرد، ئەمەش کاریگەری خۆی دەبێت لە کاتی دروست کردنی فۆرم بۆ دوو خشتەی پەیوەندیدار، بۆ ئەم مەبەستەش ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرە بەر بۆ دروستکردنی فۆرم بەم ڕێگایە:

١- لە لیستی تەنەکان OBJECTS لە چوارچێوەی داتابێس یەک کلیک لەسەر FORMS بکە.

٢- لە لیستی ئامرازەکانی چوارچێوەی داتابیسەکە یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEW بکە، دوای ئەوە خانەیەک دێتە سەر شاشە چەند ڕێگایەک پیشان دەدات بۆ دروستکردنی فۆرم.

٣- لە خانەی سەرەوەی لای ڕاست یەک کلیک لەسەر ڕێگای FORM WIZARD بکە.

٤- لە ژێرەوەشی لیستی ناوی خشتەکان بکەوەو یەک کلیک لەسەر ناوی ئەو خشتەیەی ئەتەوێت بکە (لێرەدا کلیک بکە لەسەر خشتەی TBLAUTHORS)، بڕوانە (وێنەی ١).



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)

٥- یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە. دوای ئەوە خانەیەکی تر دێت تیایدا ئەو کێلگانە هەڵئەبژێریت کە بۆ فۆرمەکەت دەتەوێ، بروانە (وێنەی ٢).

٦- لە ژێر خانەی AVAILABLE FIELDS یەک کلیک لەسەر ناوی کێلگەی (AUTHORID) بکە ئینجا کلیک لەسەر دوگمەی (>) بکە بۆ هەڵبژاردنی کێلگەکە، دوای ئەوە ناوی کێلگەکە ئەچێتە ژێر خانەی کێلگە هەڵبژێردراوەکان SELECTED FIELDS.

بەم شێوەیە ناوی هەموو کێلگەکان هەڵبژێرە یەک بەیەک یان لە جیاتی ئەوە یەک کلیک لەسەر دوگمە (>>) بکە بۆ هەڵبژاردنی هەموو کێلگەکان، بروانە (وێنەی ٣).

٦- دوای ئەوەی کێلگەکانی خشتەی یەکەمت هەڵبژارد، ئێستا لیستی TABLES/ QUERIES بکەوەو یەک کلیک لەسەر ناوی خشتەی TBLBOOKS بکە، ناوی کێلگەکانی لە ژێر خانەی AVAILABLE FIELDS دەردەکەوێت، دووبارە لە ژێر خانەی AVAILABLE FIELDS یەک کلیک لەسەر ناوی کێلگەی (BOOKID) بکە ئینجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی (>) بکە بۆ هەڵبژاردنی کێلگەکە، دوای ئەوە ناوی کێلگەکە ئەچێتە ژێر خانەی کێلگە هەڵبژێردراوەکان SELECTED FIELDS.

بەم شێوەیە ناوی هەموو کێلگەکان هەڵبژێرە یەک بەیەک یان لە جیاتی ئەوە یەک کلیک لەسەر دوگمە (>>) بکە بۆ هەڵبژاردنی هەموو کێلگەکان، بروانە (وێنەی ٤).

٦- دوای تەواو بوون لە دەستنیشانکردنی ناوی کێلگەکان یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە.

وێنەی (٥)

٧- خانەیەک دێت بەناوی WHAT LAYOUT WOULD YOU LIKE FOR YOUR FORM?، تیایدا دەست نیشانی شێوازی پیشاندانی داتا ئەکەیت لەسەر فۆرمەکەت، پرۆگرامی ئەکسێس بەشێوەی دیفۆڵت شێوازی COLUMNARی هەڵبژاردوە بۆ فۆرمی سەرەکی و شێوازی DATASHEET بۆ فۆرمی لاوەکی SUBFORM هەڵبژاردووە، بروانە (وێنەی ٥).

٨- یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە.

٩-دوای ئەوە خانەیەک دێت بەناوی WHAT LAYOUT WOULD YOU LIKE FOR YOUR SUB FORM? بۆ هەڵبژاردنی شێوازێک کە جۆرێکە لە فۆرماتی فۆنتەکان و باکگراوندی فۆرمەلاوەکیەکە SUB FORM، پرۆگرامی ئەکسێس بە شێوەیەکی دیفۆڵت شێوازی DATASHEET ی هەڵبژاردوە، ئەگەر ویستت بیگۆڕیت یەک کلیک لەسەر ناوی ستایلەکە بکە، بروانە (وێنەی ٦).

١٠- یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە.

١١-دوای ئەوە خانەیەک دێت بەناوی

وێنەی (٦)

وێنەی (٨)

وێنەی (٧)

WHAT STYLE WOULD YOU LIKE? بۆ هەڵبژاردنی ستایلێک : ستایلیش جۆرێکە لە فۆرماتی فۆنتەکان و باکگراوند بۆ فۆرمە سەرەکیەکەMAIN FORM، پرۆگرامی ئەکسێس بە شێوەیەکی دیفۆلت شێوازی STANDARD ی هەڵبژاردوە، ئەگەر ویستت بیگۆڕیت یەک کلیک لەسەر ناوی ستایلەکە بکە ئینجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە، بڕوانە (وێنەی ٧).

١٢- دوای ئەوە خانەیەک دێت بە ناوی WHAT TITLE WOULD YOU LIKE FOR YOUR FORM?، بۆ نووسینی ناو و ناونیشانی فۆرمەکە، پرۆگرامی ئەکسێس خۆی ناوێک لەسەرچاوەی داتاکەوە وەردەگرێت، بۆ گۆڕینی یەک کلیک لەسەر ناوەکە بکەو دەست بکە بە گۆڕینی، ناوی فۆرمە سەرەکیەکە بنێ frmAUTHORS ناوی فۆرمە لاوەکیەکە بنێ fsubBOOKS، بڕوانە (وێنەی ٨).

١٢- یەک کلیک لەسەر دوگمەی FINISH بکە، پرۆگرامی ئەکسێس دەست دەکات بە دروستکردنی فۆرمی سەرەکی و لاوەکی و دوای تەواوبوونی یەکسەر دەیهێنێتە سەر شاشە، بڕوانە (وێنەی ٩).

وێنەی (٩)

# چۆنیەتی دابەشکردنی مۆسیقا لەبەرنامەی Cool Edit Pro




وینەی (١)

ئا: کاوە سلێمان

بەڕێزان وەک لەئەلقەی پێشوودا باسمان لەگرنگی ئەم بەرنامە سەرکەوتوەکرد کەگرنگیەکی ئەوتۆی هەیە لەبواری دەنگی چەند گۆڕانکاری زۆربەهێز بەسەر دەنگ دادێنێت لەم جارەشدا باس لەچۆنیەتی دابەشکردنی مۆسیقاو گۆرانی دەکەین واتا زۆرجار ئێمە گوێبیستی گۆرانیەک دەبین ئەم گۆرانیە شێوەی (ستریۆ)یە دووخەتە واتا مۆسیقا لەسەماعەیەک دەبیستین گۆرانیەکەش لەسەماعەیەکیتر دەبیستین بەلام زۆربەی گۆرانیەکان ستریۆنین بەتایبەتی گۆرانیە کۆنەکانی کوردی زۆربەیان (مۆنۆ)ن واتا دووخەت نینە ئەم کردارەش لەبەرنامەی کول ئیدت پرۆ زۆرئاسانە سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە ئینجا ئەو دەنگەی پێویستمانە دێنینە ناو بەرنامەکە پاشان لەنووسینەکانی سەرەوە EFFECTS دەکەینەوە لەوێوە AMPLITUDE لەوێشەوە PAN/EXPAN کلیک دەکەین بەم شێوەیە (وێنە ١) ئینجا لەم لیستەدا (CENTER OF THA LEFT(WIDE ئینجا OK دەکەین بەم شێوەیە (وێنە ٢).




وینەی (٢)

# زنجیره (٣) له به‌رنامه‌ی Adobe Preimere

فه‌یسه‌ڵ مه‌عروف



وینه‌ی (١)

## چاککردن و راست کردنه‌وه‌ی دیمه‌نه‌کان

زۆر جار له‌کاتی نیشاندانی دیمه‌نه‌کاندا ده‌بینین له هه‌ندێ شوێن هه‌ست ده‌که‌ین دیمه‌نه‌که له جووڵه ده‌که‌وێت یاخراپ بووه، بۆچاککردن و راست کردنه‌وه‌ی دیمه‌نه‌کان له ئه‌دۆبدا ئه‌م هه‌نگاوانه ده‌گرینه به‌ر:

١) سه‌ره‌تا فایلی یه‌که‌م BOYS.AVI ده‌که‌ینه‌وه و هه‌ڵده‌ستین به سڕینه‌وه‌ی به‌شێک له دیمه‌نه‌که له‌و شوێنه‌ی که‌وا وێنه که له جووڵه ده‌وستێت.

٢) له په‌نجه‌ره‌ی TIMELINE دوو کلیک له سه‌ر فایله‌که ده‌که‌ین بۆ ئه‌وه‌ی له په‌نجه‌ره‌ی بینین SOURCE دیمه‌نه‌که نیشان بدرێت سه‌یر ده‌که‌ین که‌وا دیمه‌نه‌که هه‌ڵه‌یه‌کی تێدایه ئه‌وه‌یش وه‌ستانی دیمه‌نه‌که‌یه له جووڵه.

٣) به دوای دیمه‌نه راسته‌که ده‌گه‌ڕێین SET LOCATION وێنه‌ی (١) ژماره(١) بۆ ئه‌وه‌ی دیمه‌نی پێش کرداری وه‌ستانی دیمه‌نه‌که له جووڵه ببینین له چرکه‌ی (٤،١٢) ئه‌ویش به کار هێنانی دوگمه‌ی بۆ پێشه‌وه و دواوه به مه‌به‌ستی دۆزینه‌وه‌ی دیمه‌نه راسته‌که پاش دۆزینه‌وه کلیک له سه‌ر هێمای MARK OUT ده‌که‌ین، پاشان یه‌کسه‌ر دوگمه‌ی APPLY له‌سه‌رووی په‌نجه‌ره‌ی بینین به ده‌ر ده‌که‌وێت کلیکی له‌سه‌ر ده‌که‌ین بۆ ته‌واو کردنی کرداری بڕین CUT.

٤) له هه‌نگاوی پێشوو هه‌ڵساین به بڕینی به‌شێک له دیمه‌نه‌که وه‌کاته‌که‌شی له (٧،١٤چرکه) کورت بۆته‌وه بۆ(٤،١٢چرکه)، وه له په‌نجه‌ره‌ی ده‌ستکاری TIMELINEشاردراوه‌ته‌وه. وێنه‌ی (٢).

٥) ئێستا هه‌ڵده‌ستین به پڕ کردنه‌وه‌ی ئه‌و که‌لێنه‌ی که دروست بووه له له



وینه‌ی (٢)



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)

هێڵی دەستکاری، ئەویش بە گێڕانەوەی دیمەنەکان کەمێک بۆ دواوە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکە، بابەتی دووەم رادەکێشین تا شوێنی بەشە بڕاوەکەی بابەتی یەکەم بگرێتەوە وە بابەتی سێیەمیش رادەکێشین بۆ ئەوەی ئەو بۆشایە پڕبکاتەوە کەبابەتی دووەم دروستی کردووە، وەبەم شێوەیە تا دوا دیمەن. رێگای دیار کردن بە کار دەهێنین بۆ هەڵبژاردنی فایلە گردبووەکان و پاشان لەگەڵ یەک دەیان جووڵێنین، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش دەچینە سەر ئامرازەکانی دیاری کردن SELECTION TOOL وبەردەوام دەبین لەسەر کلیک کردن تا لیستی ئایکونە شاراوەکانمان بۆ بە دیار دەکەوێت و دواتر ئەو ئامرازە هەڵدەبژێرین کە نیشانەی تیشکی هەیە، کە هەڵدەستێ بە دیاری کردنی بابەتی نێو پەنجەرەی دەستکاری و سەرجەم بابەتەکانی دوای ئەم بابەتە، یاخود بەهۆی کیبۆرد M دادەگرین بۆ گەیشتن بەم فەرمانە· وێنەی (٣)·

٦) پاش هەڵبژاردنی ئەم فەرمانە بە هۆی کێرسەری ماوس دەچینە سەر بابەتی دووەم، کاتێ کێرسەری ماوسەکە دەبەینە سەر شریتی دیمەنی دووەم .CYCLERS AVI شێوەی کێرسەر دەگۆڕێت بۆ تیشک ئەو کات فەرمانەکەی لە سەر جێ بەجێ دەکرێت، لەسەر فایلەکە کلیک دەکەین بۆ هەڵبژاردنی وە بە شێوەی ئۆتۆ فایلەکانی تر هەڵدەبژێردرێت · وێنەی (٤)·

٧) بابەتەکان رادەکێشین بەرەو لای چەپە بە ئاراستەی دیمەنی یەکەم تاوەکو لێواری سەرەتای دیمەنی دووەم لەگەڵ لێواری کۆتایی دیمەنی یەکەم دێنە تەک یەک، ئەم کردارەش بە هۆی بەگەڕ خستنی سیستەمی کێشانی بەرەو لێوارەکان TOGGLE SNAP TO EDGES دەبێت بە شێوەی ستاندەر کردارەکە ئاسانە·وێنەی (٥)· بۆ راگرتنی ئەم فەرمانەش دەگەڕێینەوە سەر ئامرازی دیاری کردن SELECTION وە یاخود دوگمەی V لە کیبۆرد. وێنەی (٦)·

٨) پاش ئەوەی دیمەنەکانمان رێکخست بۆ بینینی ئەنجامەکەی کرداری بینین ئەنجام دەدەین ئەویش بە داگرتنی دوگمەی SPACE لە کیبۆرد.

٩) بۆ ئاخنینی (ادراج) فایلی دەنگی لەگەڵ دیمەنەکان، لە پەنجەرەیPROJECT فایلیMUSIC.WAV هەڵدەبژێرین و رادەکێشین و دایدەبەزێنینە چینی یەکەمی دەنگ1 AUDIO وێنەی (٧)·

١٠) دووبارە کرداری بینین ئەنجام دەدەین وە دوگمەی PLAY لە پەنجەرەی PROGRAMدادەگرین وەیا دوگمەی SPACE لە کیبۆرد·وێنەی (٨)·

١١) لەکاتی ئەنجامدانی کرداری



وێنەی (٦)



وێنەی (٧)



وێنەی (٩)



وێنەی (٨)

بینین تێبینی ئەوە دەکەین کەوا دیمەنی یەکەم لەگەڵ دەنگەکە تا رادەیەکی باش گونجاوە بەڵام کە دەگاتە دیمەنی دووەم دەبینین دوای کەمێک لە ناکاو ئیقاعی دەنگەکە دەگۆڕێ، ئەوەی لە سەرمانە کارێک بکەین بۆ گونجاندنی ئەو گۆڕانە لە ناکاوەی فایلە دەنگیەکەیە لەگەڵ سەرەتای دیمەنی دووەم، بۆ گونجاندنی دیمەنەکە لەگەڵ دەنگەکە ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر:

أ- سەرەتا هەڵدەستین بە دیاری کردنی ئەو خاڵەی کە ئیقاعی دەنگەکەی تیدا دەگۆڕێ.

ب- دەچینە سەرپەنجەرەی TIMELINE و دەبل کلیک لە سەر فایلی دەنگیەکە MUSIC.WAV دەکەین. وێنەی (٩).

ج- بە شێوەیەکی ئۆتۆ بابەتە دەنگیەکە دەچێتە پەنجەرەی بینین SOURCE وە دوگمەیPLAY دادەگرین بۆ بە کار خستنی فایلە دەنگیەکە و دەبینین ئیقاعی دەنگەکە لە خانەی TIMECODEوە لە چرکەی (٥,١٧) لە کاتی فایلە دەنگیەکە ئیقاعەکە دەگۆڕێت . وێنەی (١٠).

د- هەوڵدەدەین بە هۆی هەردوو دوگمەی بۆ پێشەوەو دواوە لە سەر چرکەی (٥,١٧) راوەستین.



وێنەی (١٠)

ه- نیشانەیەکی گەرانەوە بۆئەم خاڵە دیاری دەکەین، وە لە پەنجەرەی بینین SOURCE دوگمەی MARKER کلیک دەکەین و لە لیستەکە فەرمانیMARK کلیک دەکەین و دواتر خاڵێکی نوی هەڵدەبژێرین با خاڵی POSTER FRAME بێت وێنەی (١١).

و- پاش هەنگاوی سەرەوە ADOBE PREMIERE هەڵساوە بە زیاد کردنی نیشانەیەک لە سەر شریتی بابەتی دەنگیەکە و ئەو خاڵەی کە ئیقاعی دەنگیەکەی تیدا گۆڕاوە و تەنسیقێکی دیار لە نێوان سەرەتای دیمەنی دووەم و ئەم خاڵەدا نیە. وێنەی (١٢).



وێنەی (١٢)



وێنەی (١١)

# دانانی چەند جولەیەک لەسەریەک لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ

وێنەی (١)

ئا: فاخیر محمود میرزا

بەڕێزان وەک لەزنجیرەکانی پێشوو باسمان لەگرنگیەکانی ئەم بەرنامەیەکردوە لەم جارەشدا دیسان باس لەیەکێک لەگرنگیەکانی ئەم بەرنامەیەدەکەین ئەویش دانانی جولەیەکە کە ئەویش بەگۆرینی جولەکە بەچەند شێوەیەک واتا تۆ جولەیەک بەکاردێنی بەڵام حەزدەکەی پێش تەواو بوونی ئەو جولەیە چەند جولەیەکی تری بدەیتی ئەمەش کردارێکی زۆر ئاسانە سەرەتا بەرنامەکە دەکەیتەوە پاشان ئەو وێنەیەی یاخود ئەو ڤیدیۆیەی پێویستتە دێنیتە ناو بەرنامەکەو ئینجا لەسەرەوەی جولەکان لیستێکی نووسین هەیە ئەم لیستە دەکەیتەوە دەیگۆڕیت بۆ MOVING PATH بەم شێوەیە (وێنە ١) ئینجا یەکێک لەجولەکان رادەکێشیت بۆسەر وێنەکە یان بۆ سەر گۆرانیەکە لیستێک دێتە بەرچاو لەناوەڕاستی لیستەکە هێمای پلەی دیارە پلەی دەکەیت بەڵام ناهێڵێت تا کۆتایی پلەی بێت لەناوەڕاست رایدەگریت پاشان سەیری لای چەپی ئەم لیستە بکە

هێمای کۆ (+) دیارە جارێک بەماوس کلیکی لەسەربکە لەگەڵ کلیک کردن جولەیەک زیاد دەبێت دیسان برێکی تر پلەی بکەو رایگرە دیسان هێمای کۆ لێبدە واتا هەرچەند جاری ئەم کۆ یە لێبدەیت ئەوەندە جولەیە زیاد دەبێت پاشان OK دەکەیت بەم شێوەیە (وێنە ٢) هەروەها لەچوارگۆشەی سەرەوەی ئەم لیستە لەلای چەپ جولەکە کەسک و سور دیارە دەتوانی بەکەیفی خۆت ئاراستەی جولەکە بگۆڕیت.

وێنەی (٢)

## زنجیرەی (٢) لە بەرنامەی ڤیژوەڵ بەیسک

# تەشفیر کردنی نووسراوی نهێنی بەرێگای قەیسەر لە ڤیژوەڵ بەیسک

ئا: ئارام شەپرێو
دەرچوی کۆلیژی زانست/بەشی کۆمپیوتەر
shaprew@yahoo.com

خوێنەرانی بەرێز پاش ئەوەی لە ژمارە حەوتی پێشوو شارەزایەکمان پەیدا کرد لە رووی پێکهاتە سەرەکیەکانی بەرنامەی ڤیژوەل بەیسک وە فرمانەکانی هەر یەکە لەم پێکهاتانە وە چۆنیەتی دیزاین کردنی پرۆژەکان لە ناو یەک (FORM). بە پشت بەستن بە و زانیاریانەی پێشوو هەوڵ دەدەین لەم ژمارە تیشکێک بخەینە سەر دیزاین کردنی (FORM) یێک وە دانانی بەرنامەیەک بۆ تەشفیر کردنی نووسراوێکی نهێنی کە ئەم بەرنامانە زیاتر لە دەزگا هەواڵگریەکاندا بەکاردەهێنرێت بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی زانیاری بەشێوەیەک ئەگەر ئەو زانیاریانە بکەوێتە دەست خەڵکانێکیش نەتوانن سوود لەم زانیاریانە وەربگرن چونکە ئەو نووسراوانە تەنها لایەنی ئاراستە کراو دەتوانن بەپێی ی ئەو زانیاریانەی کە نووسراوەکەی پێ تەشفیر کراوە دەتوانن سوود لەم زانیاریانە وەربگرن. جگە لەمە ئەمە بابەتێکی هەرە گرینگە لە زانستی کۆمپیوتەر بۆ پاراستنی کۆمپیوتەر کەمادەیەکی تایبەت هەیە بەناوی (SCURITY OF DATABASE) لە هەموو زانکۆکانی جیهان دەخوێنرێت لەو کۆلێژانەی کە تایبەتن بە بواری کۆمپیوتەر .یەکێک لەم رێگایانە رێگای قەیسەرە .

**چەند زانیاریەک دەربارەی رێگای قەیسەر بۆ تەشفیر کردنی نووسراوی نهێنی:-**

رێگای قەیسەر یەکێکە لەو رێگایانە کە بەکار دەهێنرێت بۆ تەشفیر کردنی نووسراوی نهێنی بەجۆرێک تەنیا ئەو کەسانەی زانیاریان هەبێت لەسەر چۆنیەتی تەشفیر کردنی ئەو نووسراوە، دەتوانن سوود لەم زانیاریانە وەرگرن. بۆ تەشفیر کردنیش پێویستیمان بە (KEY) دەبێت ئەو(KEY)ە ش ژمارەیەکی تەواوە هەر پیتێک لەم نووسراوە کودەکەی ژمارەیەکی دیاری کراوە جا کۆی دەکەینەوە لەگەڵ (KEY) کە پاشان دەیگۆرین بۆ (ASCII) بۆ نمونە ئەگەر ویستمان پیتی (A) تەشفیر بکەین بە جۆرێک کە نرخی (KEY=2) ئەوا ئەم بەرنامە هەڵدەستێت بە وەرگرتنی کودی پیتی (A) کە دەکاتە (٩٦) پاشان کۆی دەکەینەوە لەگەڵ (٢) کە نرخی (KEY) یە بەم شێوە (ASCII) کودی ژمارە (٩٨) وەردەگری کە دەکاتە پیتی (C) بەم رێگایە ئەو بەرنامەیە هەڵدەستێت بە وەرگرتنی هەموو پیتەکانی ئەو نوسراوە پاشان نووسراوێکی تەشفیر کراومان بۆ دەردەکەوێت بۆ نمونە ئەگەر ووشەی (KURD) تەشفیر کەین بەجۆرێک (KEY=2) ئەوا (MWTF) بۆمان دەردەچێت کە هیچ کەسێک ناتوانێت بیخوێنێتەوە تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە بزانن نرخی (KEY) چەندە .




وێنەی (١)

**چۆنیەتی دیزاین کردنی (FORM)**

سەرەتا بۆ دیزاین کردنی (FORM) پێویستیمان بەو پێکهاتانە دەبێت کە دەمانەوێت لە پرۆژەکەمان بەکاریان بهێنین. وەک لەم وێنەیە روون کراوەتەوە (وێنەی ١).

پێویستە لە لیستی (GENERAL) کە لە ژمارەی پێشوو ئاماژەمان بۆ کردوە . کلیک بکەین لەسەر پێکهاتەی (TEXT) پاشان کلیک بکەین لەسەر (FORM) وکە بە مە (TEXT) مان بۆ دەردەچێت بەهەمان شێوە دوو (TEXT) تر دەهێنین بە شێوەیەک (TEXT1) بەکاردەهێنین بۆ تیا نووسینی ئەو نووسراوە نهێنیەی کەدەمانەوێت تەشفیری بکەین.وە (TEXT2)

بەکاردەهێنین بۆ دانانی نرخی (KEY) وە (TEXT3) بەکاردەهێنین بۆ نیشاندانی نوسراوە تەشفیر کراوەکە پاش ئامادە کردنی (TEXT) لە(TEXT) هەر سێ (TEXT) کان نوسراوی (TEXT1.TEXT2.TEXT3)ی (DELETE) دەکەین بۆ دیاری کردنی کاری هەر (TEXT) ێک بۆ روون کردنەوە پێوستیمان بە سێ (LABEL) دەبێت وەک لە وێنەی سەرەوە دیارە لە (CAPTION) ی (LABEL1) دەنووسین (" نووسراوی نهێنی") وە لە(LABEL2) دەنووسین ("KEY") وە لە (LABEL3) دەنووسین ("نووسراوی تەشفیر کراوە") وە بۆ تەواو کردنی پرۆژەکەمان پێویستیمان بە (COMMAND)ێک دەبێت بە هەمان شێوە لە (CAPTION)کەی دەنووسین ( CASER) بەم شێوە دیزاین کردنی (FORM) کەمان تەواو کرد. ئێستا دەست دەکەین بە دانانی بەرنامە لە بۆ هەر پێکهاتەک بەپێ ی فرمانی پێکهاتەکە کە بەشی هەرە سەرەکی پرۆژەیە.

**چۆنیەتی دانانی بەرنامە:-**

بۆ دانانی بەرنامە سەرەتا پێویستە ئەو (FUNCTION) و گۆڕاوانەی کە لە بەرنامە بەکار دەهێنی پێناسەیان (DIFINE) یان بکەی لە (GENERAL) بەم شێوەیەی خوارەوە. وەک لە (وێنەی ٢ ) دیارە.



وێنەی (٢)

```
DIM STR AS STRING
DIM LENGTH AS INTEGER
DIM I AS INTEGER
DIM ASVAL AS INTEGER
DIM KEY AS INTEGER
DIM CHAR AS STRING * 1
```

```
PRIVATE SUB CASER(STR)
LENGTH = LEN(STR)
FOR I = 1 TO LENGTH
CHAR = MID(STR. I. 1)
ASVAL = ASC(CHAR)
ASVAL = ASVAL + KEY
IF ASVAL >= 122 + KEY THEN
ASVAL = ASVAL - 26
TEXT3.TEXT = TEXT3.TEXT +
CHR(ASVAL) END IF
NEXT I
END SUB
```

پاشان دەست دەکەین بە دانانی ئەو بەرنامەیەی کە پێویستە لە ناو (COMMAND) بنوسرێت بۆ نانی نرخ بۆ (FUNCTON) و بانگ کردنی (FUNCTION) بەم شێوەیە:

```
PRIVATE SUB COMMAND1_CLICK
(STR) = TEXT1.TEXT
KEY = TEXT2.TEXT
CALL CASER(STR)
END SUB
```

(وێنەی ٣).




وێنەی (٢)

لە کۆتایی شێوەی (FORM) ی (RUN) کراو بەم شێوە دەردەکەوێت کە دیارە ووشەی (KURD) مان تەشفیر کردووە بە (KEY=2) ووشەی (MWTF) بۆمان دەردەکەوێت کە کەس ناتوانێت بیخوێنێتەوە.



# زنجیرەی (٣) لە بەرنامەی فلاش MX

# شێوەکان Shapes

فەیسەڵ مەعروف




وێنەی (١)

شێوەکان تایبەت نین تەنها بە رنامەی فلاش MX، بەڵکو زۆربەی بەرنامەکانی وێنە لەگەڵ شێوەکان مامەڵە دەکەن، شێوەکان دەکرێنە دوو بەش:

### ١. شێوەی ئاراستە کراو Vector Shape:

ئەو وێنانەن کەوا هێڵ و چەماوە لە وێنە کێشانیاندا بەکار دێت و شێوەی دەرەوەی پێکدێنن، رەنگی هێڵەکانی وێنە کێشان رەنگیان دیاری دەکات، هەروەها دەتوانی گۆران بە سەر تایبەتمەندی هێڵ و چەماوەکان بهێنی بێ ئەوەی کاربکاتە سەر رێکی شێوەکە چونکە شێوەی ئاراستە کراو تایبەتمەندی سەر بەخۆی هەیە.

### ٢. شێوەی خاڵی Dot Shape:

ئەم شێوەیە بەوە وەسف دەکرێ کەوا خاڵی رەنگاو رەنگی بە کار هاتوو کە پێی دەوترێ پیکسڵ PIXELS بە سەر تۆڕدا




وێنەی (٣)




وێنەی (٢)

دابەش دەکرێ، کاتێ دەستکاری شێوەی خاڵی دەکەین دەتوانی پیکسڵەکان بگۆڕین نەک هێڵ و چەماوەکان، تایبەتمەندی ئەم جۆرە وێنەیە ئەوەیە سەربەخۆ نیە چونکە زانیاریەکان شێوەکە وەسف دەکا بۆ تۆڕ بە پێوەری دیاری کراو،بەمەش لەکاتی دەستکاری کردنی شێوەی خاڵی دەتوانی رێک و پێکی بگۆڕی.




وێنەی (٤)

وێنەی (٥)

## گۆڕینی شێوەی خاڵی بۆ شێوەی ئاڕاستە کراو

سەرەتا دەچینە سەر لیستی FILE وفەرمانی هێنان IMPORT کلیک دەکەین وێنەی (١)، پاش هێنانی وێنەکە بەرنامەی فلاش بەشێوەیەکی ئۆتۆ دەیخاتە سەر شانۆی کار و دواتر دەچینە سەر لیستیMODIFY و فەرمانی TRACE BITMAP کلیک دەکەین بەمەش فلاش وێنەکە شی دەکاتەوە بۆ گۆڕینی بۆ وێنەی BITMAP وێنەی (٢)، لە دوای ئەوە پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە وێنەی (٣).

١) COLOR THRESHOLD: هەڵبژاردنی رەنگ لە نێوان (١-١٠٠).ئەمەش بۆ نزیک کردنەوەی رەنگەکانی نێوان پیکسلەکانی تەنیشت یەکتر لە وێنەیەکدا.

٢) MINIMUM AREA : لە نێوان (١-١٠٠٠) دیاری دەکرێت، ئەویش دیاری کردنی بڕی پیکسلەکانی تەنیشت یەک دیاری دەکات.

٣) CURVE FIT: گونجانی چەماوە لەزۆربەی حاڵەتەکانNORMAL . SMOOTH گونجاون.

٤) CORNER THRESHOLD : ئەوە دیاری دەکات کەوا فلاش چۆن وێنەی گۆشەکان بکێشێ (چۆنیەتی کێشانی وێنەی گۆشەکان لە لایەن فلاش دیاری دەکرێت).

## گۆڕینی شێوەکان لە ڕێگای جووڵە Shape Tweening:

ئەم جۆرە جووڵەیە بەوە دەناسرێ کەوا جووڵەی گۆڕینی




وێنەی (٧)

وێنەی (٦)

شێوەکانە، بۆ نموونە دەتوانین چوار گۆشەیەک بگۆڕین بۆ دەق یا وێنەیەکی گۆڕاو بۆشێوەی ئاراستە کراو بۆ دەق، بۆ زانیاری پێویستە دوو خاڵ ڕەچاو بکرێت :

١.تەنها شێوە ئاراستە کراوەکان دەگۆڕدرێن.

٢.بۆ گۆڕینی شێوەیەکی دیاری کراو بۆ دەق TEXT، پێویستە دەقەکە بگۆڕین بۆ شێوە، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش دەچینە سەر لیستیMODIFY و فەرمانیBREAK APART کلیک دەکەین (لەباری ئاسایی دەق شێوە نیە)دەبینین دەقەکە دەگۆڕێ بۆ بەش و هێڵ.

## گۆڕینی دەق Text:

١. لەشریتی ئامرازەکان ئامرازی دەق کلیک دەکەین و دەقەکە دەنووسین.

٢. نووسینەکە بەبێ چوار چێوەی شین دەهێڵینەوە و دەچینە سەر لیستیMODIFY و فەرمانی BREAK APART کلیک دەکەین. وێنەی (٤و٥).

٣. دووبارە هەمان فەرمانی خاڵی سەرەوە کلیک دەکەینەوە، دەبینین کەوا دەقەکە گۆڕاوە بۆ شێوە. وێنەی (٦).

٤. ئێستا دەگەڕێینەوە بۆ جووڵەی شێوەکان SHAPE TWEENING: ئەم جۆرە جووڵەیە تایبەتە بە شێوە ئاراستە کراوەکان، بەم شێوەی خوارەوە جووڵە دروست دەکەین:

أ) لە چوار چێوەی یەکەم بە هۆی شریتی ئامرازەکان وێنەی چوار گۆشەیەک دەکێشین.

ب) دەچینە سەرچوار چێوەی ژمارە(٤٠) و کلیکی راستە دەکەین و فەرمانیINSERT BLACK KEY FRAME هەڵدەبژێرین وێنەی (٧).

ج) سەیر دەکەین چوار چێوەی ژمارە (٤٠) بەتاڵە وبە ئارەزووی خۆمان دەقێک دەنووسین، پاشان دەقەکە دەگۆڕین بۆشێوە هەروەک لە پێشەوە باسمان کرد.




وێنەی (٨)





وێنەی (٩)



وێنەی (١٠)

د) دەگەڕێینەوە بۆ چوار چێوەی ژمارە (١) و کلیکی دەکەین و لە پەنجەرەی تایبەتمەندی PROPERTIES و لە TWEEN فەرمانیSHAPE کلیک دەکەین . وێنەی (٨).

هـ) ئەنجامەکە بەم شێوەی لێ دێت کە لە وێنەی (٩) دا دیارە.

و) ئێستا بۆ بینینی کارەکەمان هەر دوو دوگمەی CTRL+ ENTER لە کیبۆرد دادەگرین.

## کۆنترۆڵی گۆڕینی شێوەکان Shape Hit

بریتی یە لەچۆنیەتی کۆنترۆڵی ئەوگۆڕانکاریەی کە بەسەر شێوەکان دەهێنرێن کە پێشتر باسمان کرد، دەگەڕێینەوە سەر ئەو کارەی کە پێشتر ئەنجاممان دا دەگەڕێینەوە سەر چوار چێوەی ژمارە (١).ئەم هەنگاوانە جێبە جێ دەکەین:

١.لە لیستیMODIFY دەچینە سەرSHAPE و فەرمانیADD SHAPE HIT کلیک دەکەین . وێنەی (١٠).

٢. فەرمانیADD SHAPE HIT هێمایەک SYMBOLبۆ نمونە(A) زیاد دەکاتە سەر شێوەکە. وێنەی(١١).بە ئارەزووی خۆمان دەتوانین هێمایەکە بجوڵێنین بۆ هەر لایەک و گۆشەیەک.

٣. بۆ زیاد کردنی هێماکان هەنگاوی پێشوو دووبارە دەکەینەوە یا بە هۆی کیبۆرد دوگمەکانی (CTRL+ SHIFT +H) کلیک دەکەین وێنەی(١٢).

دەچینە سەر چوار چێوەی ژمارە (٤٠) بە ئارەزووی خۆمان هێماکان دابەش دەکەین وێنەی(١٣).

٥. ئێستا بۆ بینینی کارەکەمان هەر دوو دوگمەی CTRL+ ENTER لە کیبۆرد دادەگرین. بەرنامەی فلاش جوولەی هێماکان دەگرێتە بەر بە گوێرەی دیاری کردنی خۆمان.



وێنەی (١١)



وێنەی (١٢)



وێنەی (١٣)



# زنجیرەی زمانەکانی پرۆگرامسازی

# PHP & MySQL

ئا.رەنجدەر عبدالرزاق
ranjdar_k_j@yahoo.com

## زنجیرەی (١)




وێنەی ژمارە 1

PHP کورتکراوەی (PERSONAL HOME PAGE TOOLS)ـە واتە ئامرازی دروست کردنی پەیجی تایبەتی . ئەم بەرنامەیە لەلایەن (راسمۆس لیدرۆف) دروست کراوە، بەخۆرایی و(OPEN SOURCE) بلاوی کردەوە، واتە رێگای بە کەسانی تردا کە بەرەو پێشی بەرن و کۆدی تری بۆ زیاد بکەن و توانای پرۆگرام کردنی بەهێز تر بکەن.بۆیە بوو بە یەکێک لە زمانە بەهێزەکان لە بواری ئینتەرنێت. دوو هۆی سەرەکی ئەو بەرنامەی لە ئەوانی تر پێ جیادەکرێتەوە ئەوەیە کە:

١- بە خۆرایی یە.
٢- (OPEN SOURCE)ە.

هەرچەندە PHP دەتوانێ پالپشتی هەموو داتا بەیسەکان بکات،بەلام ئەوەی ئێمە لێرە دا باسی دەکەین پالپشتی نێوان (PHP & MYSQL)ـە کە ئەویش بەرنامەیەکی بەخۆرایی یەو لە زۆربەی سایتەکاندا دەتوانی بە خۆرایی دایبەزێنی یە سەر کۆمپیوتەرەکەت . وای لێهاتووەMYSQL لەلای زۆربەی کۆمپانیاکان باشترو چاکتر بزانرێت تەنانەت لە (ORACLE) یش بەهۆی ئەوەی کە جێگیرەو بەخۆرایی یە.

چیمان پێویستە بۆ نووسینی پرۆگرام بە PHP ؟

دەتوانین هەر بەرنامەیەکی (WORD PROCESS) بەکاربهێنێ وەکو (NOTEPAD



PHPTriad 2.11 Setup: License Agreement



PHPTriad Installer

DO NOT IGNORE THIS MESSAGE
If you email or post a question that is answered in this file, you may very well hear someone (possibly me) tell you to RTFM.

Welcome to PHPTriad 2.0. This is the core installer that installs Apache, PHP, MySQL, Perl and PHPMyAdmin. They are configured to work from your C: drive and are set up in a minimal configuration. None of the PHP extensions are activated and there are no copies of the script libraries for Perl or PHP.

This configuration is suitable for testing and development on a local machine. If you intend to install PHPTriad on a live web server, you need to know that you will need to take additional measures to secure all of the components.

Cancel    Nullsoft Install System v1.42    < Back    Next >

وێنەی ژمارە 2

یان TEXTPAD....) یان هەربەرنامەیەکی تر بە مەرجێک فایلەکەت بە ئیکستێنشنی (PHP) خەزن بکەیت بۆ نموونە (MYFILE. PHP)

**چۆن پرۆگرامەکانمان ڕەن بکەین؟**

بۆ ڕەن کردنی ئەو پرۆگرامانەی کە دەینووسی و بینینیان بە شێوەی پەڕیکی ئینتەرنێت پێویستە سێرڤەرێکی تایبەتی لە سەر کۆمپیوتەرەکەی خۆت دروست بکەیت.هەموو ئەو کەسانە بە (PHP) پەڕی ئینتەرنێت دروست دەکەن دەبێت سێرڤەرێکی تایبەت دروست بکەن. مەبەستیشمان لە سێرڤەری تایبەت ئەوەیە کە کۆمپیوتەرەکەت وا لێبکەی کە بتوانی پەیجەکانی خۆتی لەناو تاقی بکەیتەوە پێش ئەوەی بینێریت بۆ ئینتەرنێت . بە شێوەیەکی گشتی ئەمە کارێکی ئاسانەو لە چەند دەقیقە زیاتر ناخایەنێت سەرەتا بچۆ ناو سیدی گۆڤارەکەوە ئەم ئایکۆنە بدۆزەرەوە (PHPTRIADSETUP2-11) وێنەی ژمارە (١)، بە دوو کلیک ئایکۆنەکە بکەوە دوای بونەوەی بەرنامەکە ئەم وێنەیە دەبینین ژمارە(٢)،تو تەنها کلیک لە سەر NEXT بکە. دەبینین ئەم جارەیان شاشەیەکی ترت بۆ دێت (وێنەی ژمارە ٣) کە ئەو فایلانەی پێویستن بۆ کارکردنی




وێنەی ژمارە 3

بەرنامەکە دێتە سەر کۆمپیتەرەکەت. ئەگەر دەتەوێت ئەو فایلانە ببینی کە کۆپی دەبن کلیک لە سەر (SHOW DETAILS) بکە . کەمێک چاوەڕوان بکە تا بە تەواوی بەرنامەکە دەچێتە سەر کۆمپیوتەرەکەت دوای تەواو بوونی کۆپیبوونی فایلە پێویستەکان و دابەزینی بەرنامەکە بۆ سەر کۆمپیوتەرەکە ئەم شاشەیە دەبینی (وێنەی ژمارە ٤) تۆ تەنها کلیک لەسەر (CLOSE) بکەو کارەکەت تەواو دەبێت .ئێستا تۆدەتوانی کۆمپیوتەرەکەت وەکو سێرڤەر بەکار بهێنی .

**ئێستاش بۆ ئەوەی کۆمپیوتەرەکەت ببێتە سێرڤەر دەبێت ئەم بەرنامەیە بەکاربێنی بەم شێوەیە :**

START-PROGRAM FILES-PHP TRIAD-STARTAPACHEدوای کلیک کردن لەسەر (START APACHE)ئەم شاشەیە دەبێتەوە (وێنەی ژمارە ٥) مانای وایە سێرڤەرەکەت بەرێک و پێکی کار دەکات ئێستا، ئەگەر بەرنامەی (INTERNET EXPLORER)بکەیتەوەو لەشریتی ناونیشانەکان ئەوناونیشانە(//:HTTP LOCALHOST)بنووسی و ئینتەر بکەیت دەبینیت یەکسەر لاپەڕەی سەرەکی ناو سێرڤەرە تایبەتی یەکەت دەبێتەوە (وێنەی ژمارە ٦). دەتوانین سێرڤەری (MYSQL)یش ڕەن بکەین و داتا بەیسیش دروست بکەیت، بەلام بەپشتیوانی خوا کاتێک گەیشتینە شوینی خۆی هەر لەوشوینە باسی دەکەین.

ئایا فایلەکانی (PHP)دەکرێت لەهەموو شوێنێک خەزن بکرێت؟

سێرڤەرە تایبەتیەکەی خۆت ناتوانێت کۆنترۆڵی هەموو کۆمپیوتەرەکەت بکات بەڵکو تەنها بەشێکی دیاری کراو کۆنترۆل دەکات. بەواتایەکی تر تو ناتوانی هەموو ئەو فایلە(PHP)یانەی




وێنەی ژمارە 4



وێنەی ژمارە 5

کەدەینووسی بەکەیفی خۆت لە هەر شوێنێکی سەر کۆمپیوتەرەکەت بتەوێت خەزنیان بکەیت، پاشانیش وەکو پەڕێکی چالاکی ئینتەرنێت مامەڵەی لەگەڵ بکەیت بۆیە ئەوپەڕانەی کەدروستیان دەکەیت دەبێت لەم ڕێرەوە (PATH) ەخەزنی بکەیت:C:\APACHE\HTDOCS .

ئەوبەرنامەیەی پێش ماوەیەک دات بەزاندە سەر کۆمپیوتەرەکەت ئەو فۆڵدەرە بە فۆڵدەری سەرەکی دادەنێت هەر کاتێکیش تۆ ناونیشانێک دەنوسیت ئەوا ڕاستەوخۆ دەتباتە ناو ئەو فۆڵدەرە، ئەگەر لێرەدا فایلەکە هەبوو پێشانت دەدات بەڵام ئەگەر نەبوو ئەوا هیچ شتێک نابینی جگە لە (ERROR MESSAGE) یک. بۆ نموونە تۆ فایلێکت هەبێت بە ناوی (MYFILE.HTML) دەبێت لەناو فۆڵدەری HTDOCS خەزنی بکەیت، بۆ ئەوەی سەیریشی بکەیت دەبێ لە شریتی ناونیشانەکان ئەم ناونیشانە بنوسیت: (HTTP://LOCALHOST/MYFILE.HTML)

هەروەها دەتوانی فۆڵدەریش لە ناو ئەو ڕێرەوە دروست بکەیت بەڵام ئەو کاتە دەبێت ناوی فۆڵدەرەکەش ئاماژە پێبدەیت لەکاتی نووسینی ناونیشانەکە.بۆ نموونە ئەگەر فۆڵدەرەکەت ناوی PHPFILES بێت و لەناو فۆڵدەری HTDOCS دانرابێت فایلەکەشت ناوی MYFILE.PHP بێت بۆ ئەوەی ئەم فایلە بکەیتەوەو سەیری بکەیت دەبێت لە شریتی ناونیشانەکان ئەمە بنوسیت:

HTTP://LOCALHOST/PHPFILES/ MYFILE.PHP

### یەکەم نموونەی عەمەلی بە PHP:

دوای ئەوەی سێرڤەرەکەی خۆت بەکارخست برۆ بۆ C:\APACHE\HTDOCS لەوێدا فۆڵدەرێک دروست بکە بە هەرناوێک بێت ئێمە لێرەدا ناوی دەنێین PHPFILES ئێستا بەرنامەی(NOTEPAD)بکەوە ئەم کودانەی خوارەوە بنوسە :

PHP ECHO"THIS IS MY FIRST?>
<? ;" PROGRAM

ئێستا ئەم فایلە لەناو فۆڵدەری PHPFILES خەزن بکە بەناوی .MYFILE PHP پاشان لە ئەدریس باری ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر ئەم ناونیشانە بنووسەو ئینتەر بکە:HTTP://LOCALHOST/ PHPFILES/MYFILE.PHP

**دەبینیت لە شێوەی پەڕێکی ئینتەرنێت بەم شێوەیە دەبێتەوە (وێنەی ژمارە٧).**

ئێستا بابزانین چیمان کردووەو مانای ئەم کۆدانە چی یە؟ لە دێری یەکەمدا بە سێرڤەرەکەمان دەڵێین کە ئەو ڕستانەی کە لەدوای ڕیزی یەکەم هاتوون بەزمانیPHP نوسراوە بۆ ئەوەی بتوانی کۆمپایلی بکات و بیکاتە شێوەیەک کە ئێکسپلۆرەر تێی بگات. لە دێری دووەم داتەنها ڕستەی THIS IS MY FIRST PROGRAM چاپ دەکەین لەسەر لاپەرەکەمان. واتە هەرکاتێک ویستت شتێک چاپ بکەی دەبێت ووشەی ECHO بنووسی پاشان لەناو دەبل کۆتەکەدا ئەو شتەی دەتەوێت نیشانی بدەی بینووسی و لە کۆتایی دا سیمیکۆلۆن دابنێیت (;). نموونەی تر .

;"ECHO"HI
;"ECHO"HOW ARE YOU

ڕستەی کۆتایی ئەوەیە کە بە سێرڤەرەکە دەڵێت کۆدی PHP تەواو بوو .

**ئەگەر هەر کێشەیەکت بۆ دروست بوو دەتوانیت بە ئیمەیل پەیوەندیم پێوە بکەیت.**



وێنەی ژمارە 7



وێنەی ژمارە 6

## زنجیرەی (١) لەبەرنامەی AUTOCAD

# لە بۆردەوە بۆ کیبۆرد

ئامادەکردنی: غزالە یونس



وێنەی (١)

سەرەتا بە خوێنەرانی ئەم گۆڤارە رادەگەیەنم کە وا بە پێی پێویست مانگانە لە چە نـد زنجیرەیەک باس لە بەرنامەی (AUTOCAD) دەکـەم وەک ئامەدەکاری ئەم بەرنامەیە هەول دەدەم مانگانە باس لە چەند ئایکۆنێک بکەم و بیخەمە بەردەم خوێنەران بە هیوای سـوود وەرگرتنیان سەرەتا وشەی (AUTOCAD) مانای چییە؟
* AUTO :AUTOMATIC ئۆتۆماتیک *
C :COMPUTER
A: ADID
DESIGN:D

سەرەتا وەک هەموومان دەزانین کاری ئەنـدازەو وێنەکیشـان کارێکی سـادەو سـانا نیـە هەڵبەتـە کاتێکی زۆریشـمان دەوێـت .بەڵام لێرەدا بە هۆی زانینی ئەم بەرنامەیـە دەتوانیـن وێنەی ئـە ندازەی و نەخشـەی باڵەخانەو رێگا بەشـێوەی بەرجەسـتەو رووتەخت دروست بکەین بـۆ نموونە ئـەم دوو وێنەی خـوارەوە وێنەی دوو خانووی بەرجەستەیە کە بە (AUTOCAD) دروسـت کـراوە (وێنەی١) چـۆ نیەتـی کردنـەوەو ئیش پێکردنـی بـە رنامەکـە : لە رێگای کلیـک کردن لە سـەر شـریتی مەهـام (START) پاشـان PROGRAMS پاشـان نیـش AUTOCAD (وێنەی ٢).
دوای کردنـەوەی بـە رنامەکە ئەمەی خوارەوە پێناسـەیەکی کورتی شـریت و ئایکۆنەکانی سە ر رووی AUTOCAD
١-شـریتی ناونیشـان (العنـوان): پێک هاتـوە لە ناوی بە رنامـەو ناوی فایلەکە کە دەکەوێتە بە شـی سـەرەوەی رووی بە رنامە.
٢-شریتی لیستە کان (القوائم):پێکهاتووە لە کۆمەڵێک فرمان کە هەریەکێکیان چەند ئایکۆنێـک دەگرێتە خۆی وەک (DRAW,F ORMAT,MODIFY.........).
٣-شـریتی کـە رسـتە کان (الادوات): لەکۆمەڵێک ئایکۆن پێک هاتووە کەئەمیش کارەکان ئاسان دەکات.
٤- شـوێنی وێنەو کارکـردن: ئەمیش ئەم شوێنەیە کەتایبەتە بۆ دروستکردنی وێنـەو ئەنجامدانـی کارەکانمـان. کـە لەسـەرەتادا رەنگی رەشـە. وە دەتوانین دەسـتکاری رەنگی بکەین و رەنگی تری بۆ دەست نیشان بکەین.
٥- شـریتی فەرمانەکان (COMMAND): ئەمیش لە خـوارەوەی رووی بەرنامەیە لـە رێـگای ئەویشـەوە دەتوانیـن ناوی ئایکۆنەکان بنووسـین و فرمانەکان جی بە جێ بکەین.
٦-شـریتی بار (الحالە): پێک هاتووە لە



وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

چەند ئایکۆنێک کە یارمەتی دەرن لەکاتی وێنەکێشان دا (GRID.SNAP.OROTHO٠٠ ٠٠٠٠٠٠٠٠٠) .(وێنەی ٣)

## دەست نیشان کردنی شوێنی وێنە کردنت

پێش دەست پێکردنت بەهەر کارێک کە بتەوێ بە بە رنامەی (AUTOCAD) ئەنجامی بدەیت، سەرەتا دەبێت شوێنی ئیش کردنەکەت دەست نیشان بکەیت، جا ئەمیش بەئا رەزووی خۆت وبەپێی دووری وێنەکەت دەست بە م کارانەی خوارەوە دە کەیت . لێرەدا دەچینە سەر لیستی(FORMAT) و پاشان ئایکۆنی (DRAWING LIMITS) دەستنیشان دەکەین ئینجا لەCOMMANDخالی سە رەتا(٠،٠)) دەنوسین و ENTER دە کەین. پاشان خالی کۆتا یی تابلۆکە دەستنیشان دەکەین کە(شوێنی وێنە کردنەکە)(٢٠٠،٣٠٠)) ئینجا ENTER، دووبارە بانگی فرمانە کە DRAWING LIMITS دەکەینەوە بەئیشی دەخەین بە نوسینی ووشەی (ON) لە COMMAND. پاشان دە چینە سەر لیستی VIEW هە ڵبژاردنی ZOOM پاشان دەست نیشان کردنی ئایکۆنی ALL (بۆ پیشاندانی سنوری تابلۆ کەمان، بەم ڕێگەیەی خوارەوە دەبێت.

٠FORMAT-----DRAWING LIMITS
SPECIFY LOWERR LEFT
٠،٠:<٠،٠>[CORNER[ON/OFF
(دەست نیشان کردنی خاڵی سەرەتا)
COMMAND :SPECIFY UPPER
RIGHT CORNER[470.397]:200.300
*(دەست نیشان کردنی خاڵی کۆتایی)
٠COMMAND:DRAWING LIMITS
ONSPECIFY LOWERR LEFT:
٠<٠،٠>[CORNER[ON/OFF
VIEW-------ZOOM----ALL (گەورە کردنی شوێنی وێنە کردنە کە بەقەد شاشاکە).

لە سەر شاشەکەش بەم شێوەیە دەبێت، (وێنەی ٤).

## دەست نیشان کردنی ڕژێمی یەکەکان:

ئەویش بە هەمان شێوە دەچینە سەر لیستی FORMAT دە ست نیشان کردنی UNIT چوار گۆشەیەک دێتە بەردەممان کە تێیدا باس لە چۆنیەتی دەست پێکردنی کا رەکانمان دەکات کە سە رە تا بەچ شێوەیەک کار بکەین بۆ نموونە دەست نیشان کردنی گۆشەی ئیش کردن ئایا بە چ گۆشە یەک کاربکە ین یان دە ست نیشان کردنییەکەی دووری ئایا بە میلیمەترە. لە خوارەوەش (DIRECTION) هەیە بە کلیک کردن لە سەری چوار گۆشەیەک دەردەکەوێت کە تێیدا بۆ دەست نیشان کردنی کارکردن بە پێی میللی کاتژمێر یان بە پێچەوانەی میللی کاتژمێرو یان دیاری کردنی ڕووەکان ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا باکورو باشور (وێنەی ٥).



وێنەی (٤)




وێنەی (٥)

# ٣٨ ڕێنمایی بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەر

زنجیرەی یەکەم

**شاخەوان عمر حسن**
shakhawano@yahoo.com

بەرنامەکانی کۆمپیوتەر یان یاریکردن یان هەرکارگوزاریەکی تر لەکۆمپیوتەر پێویستی بە کات و نەبونی هیچ هەڵەو گرفتێک لەکۆمپیوتەر دەکات بۆ ئەوەی کارەکانی خۆت بە ئاسایی و زۆر بەهێمنی ببەیتە سەر . لەم پێودانگەدا زۆر جار لەبەر هەر هۆیەکی دیار یان نادیار بێت کۆمپیوتەرەکەت دەوەستێت و جام دەکات یان ئەوەتا هێواش و لەسەرخۆ کار دەکات بەمەش بەکارهێنەر وەرس و کاس دەکات و زۆر جار واز لە بەکار هێنان دێنێت . من بە زنجیرە لەگۆڤاری کۆمپیوتەر زیاتر لە ٣٨ ڕێنمایی گرنگ باس دەکەم بەو هیوایەی کە سودمەند بن و کۆمپیوتەرەکەتان لە جام بوون و خاوبون دورکەوێتەوە .لەوانەیە کە بتەوێ کۆمپیوتەرەکەت بەباشترین شێوە کار بکات وات بەباش بزانیت کە کۆمپیوتەرە کۆنەکەت بگۆڕیت بە نوێترین و خێراترین یان ئەوەتا پارچە گرنگەکانی بگۆڕیت، بەڵام ڕەنگە ئەمە باشترین ڕێگە، نەبێت چونکە لەم بارەدا لەوانەیە هێشتا تەواوی گرفتەکان چارەسەر نەکات یان لەوانەیە میزانیەی تەواو نەبێت . جا من بەم خاڵانەی خوارەوە دەمەوێ کۆمپیوتەرەکەت بەباشترین شێوە کار بکات و بتوانیت زۆر بە ئاسودەیی کاری لەسەر بکەیت، بەڵام پێویستە خاڵ بەخاڵ لەگەڵ من بێت:

وێنەی (١)

**١- هێشتنەوەی بەشێک لەقەبارەی هارد دیسک بە بەتاڵی:**

یەکێک لە گرنگترین ڕێگاکانی کاریگەر لەسەر خێرایی و کارکردنی کومپیوتەر بەبێ گرفت بریتیە لە هێشتنەوەی بەشێک لە هاردی کۆمپیوتەر بۆ نمونە کاتێک هاردی کۆمپیوتەر ئەو بەشەی کە سیستەمی لەسەرە زیاتر لە ٩٠٪ بەکار هات و بەزانیاری و بەرنامەو داتا داگیر کرا ئەوا کۆمپیوتەرەکەت زۆر زۆر زۆر هێواش دەبێت . باشترین ڕێگەش بۆ چارەسەکردنی ئەم گرفتە پێویستە کۆمپیوتەرەکەت پاک بکەیتەوە لە فایل و زانیاری زیادە یان ئەوەتا بەدەست ئەویش



وێنەی (٢)

گەران بەدوای فایلەکان و سرینەوەیان یان لەرێگای فەرمانی پاک کەرەوە لەناو سیستەم (WINDOWS DISK CLEAN). بۆ جێبەجێکردنی ئەم کردارە لەسەرەتادا بچۆرە ناو (MY COMPUTER)، لەویش کلیکی راست لەسەر ئەو بەشەی هارد دەکەین کە سیتەمی لەناو دامەزراوە (کەبەشێوەیەکی گشتی (C) بەکاردێت پاشان کلیک لەسەر ((PROPERTIES)) دەکەین وەک لەوێنەی (١) روونە، پاشان لە بەشی (GENERAL) کلیک لەسەر DISK) (CLEANUP بروانە وێنەی (٢) پاشان دەست دەکەین بە دەست نیشان کردنی هەموو ئەو بەشانەی کە دەمانەوێت پاکیان بکەینەوە بروانە وێنەی (٣) پاش دەست نیشان کرد کلیک لەسەر (OK) دەکەین بەمەش کرداری پاک کردنەوەی کۆمپیوتەرەکەت دەست پێدەکات.




وێنەی (٣)

٢- کاری دیفراگ مێنت بۆ کۆمپیوتەرەکەت ئەنجام بدە (DEFRAGMENT)

ئەگەر پاک کردنەوەی کۆمپیوتەرەکەت بەشێک بێت لە چاک کردنی کاری کۆمپیوتەرەکەکەت ئەوا نەهێشتن یان کەمکردنەوەی بەشەکانی هاردی کۆمپیوتەرەکەت بە پلەی دووەم دێت لە چاک کردن و کاراکردنی کۆمپیوتەرەکەت، بەپێی تواناو هەبونی بوار بتوانیت هەموو دوهەفتە جارێک کۆمپیوتەرەکەت دیفراگ بکەیت، لەژمارەکانی پێشوی گۆڤاری کۆمپیوتەر بەدرێژی باس کراوە بۆیە من لێرەدا باسی ناکەم .

٣- بەکارهێنانی سیستەمی NTFS

ئێستا دوو سیستەمی گرنگ هەن کە کارورێکخستنی فایلەکان دەکەن لەنێوانیشان سیستەمی (NTFS) بە سیستەمێکی کاراو باشتر دادەنرێن کە کورتکراوەکەی (NEW TECHNOLOGY FILE SYSTEM) لەچاو سیستەمی باوی (FTP) کە کورتکراوەی (FILE ALLOCATION SYSTEM) جا واباشە هەر لەسەرەتای دامەزراندنی ویندۆز دا دەست نیشانی ئەم سیستەمەبکەیت و دایمەزرێنیت یان ئەگەر قەبارەی هاردەکەت زۆر بچوک نەبوتەوە ئەوا دەتوانین بە فەرمانی دۆس سیستەمی فایلەکان بگۆرین دوای کردنەوەی دۆس ئەویش چونە سەر لیستی دەستپێکردن و دوایی بۆ لیستی بەرنامەکان و لەویش بۆ بەشی پاشکۆی بەرنامەکان و دواتر (COMAND PROMPT) دەست نیشان دەکەین وەک لەوێنەی (٤) دیارە پاشان لەناو ئەم بەرنامەیەدا کردارەکانی گۆرینی سیستەم دەست پێدەکەین کە بریتیە لە کرداری (CONVERT) لەرێگای خزمەت گوزاری (CONVERT.EXE) ئەویش بەنوسینی :CONVERT C:/FS) (NTFS/V پاشان ئینتەر دەکەین دەست دەکەین بە جێبەجێکردنی هەنگاوەکان . بەلام بۆ زانیاریت ئەم کردارە کاتێکی زۆر دەخایەنێت واباشە شەو بکرێت یان لەکاتی دامەزراندنی ویندۆز ئەم سیستەمە دەست نیشان بکەیت .




وێنەی (٤)

# کۆمپانیای ئەدۆب (ADOBE) کۆتایی بەناکۆکی کرینی کۆمپانیای مایکرۆمیدیا (Macro Media)ی هێنا




**ئا: دارەڤان محمد**

کۆمپانیای ئەدۆب (ADOBE)کە لەبواری بەرنامە مالتیمیدیاکان کاردەکات خاوەنی توانایەکی زۆربەرزە بەرهەمێکی زۆری لەبەرنامە ئەلیکترۆنیەکانی خستوتە بازارەکانی جیهان سودەکانیشی بەرچاوە بەم دواییە هەستا بەپێشخستنی کۆمپانیاکەی ئەمەش بەکڕینەوەی کۆمپانیای ماکرۆمیدیا (MACRO MEDIA) بەم دوایە ئەم هەواڵەی راگەیاند لەشەممەی رابردوو لە ٣ی دیسمبەری کانونی یەکەم بەمەش کۆمپانیای ماکرۆمیدیا (MACRO MEDIA) لەژێر ناکۆکیەکانی گشت کۆمپانیاکان رزگاری بوو شایانی باسە زۆربەی کۆمپانیاکان هەوڵی کڕینەوەی ئەم کۆمپانیایەیان دەدا . هەروەها یەکێک لەهەواڵە دڵخۆشکەرەکان بۆئێمە ئەوەیە کە کۆمپانیای ئەدۆب (ADOBE) مژدەی گەورەترین کومپانیای بەرهەم بلاوکەرەوە دەبێت لەهەموجیهان وەک(بروس تشیزان) کە بەرێوبەری گشتی کۆمپانیای ئەدۆب (ADOBE) ە رایگەیاند کەهەردوو کۆمپانیا کاردەکەن لەپێناوی بەرهەمێکی زۆرو سودێکی زۆر هەروەها مژدەیMACRO MEDIA STODIO 8 و ADOBE® CREATIVE SUITE 2و MACROMEDIA FLASH PROFESSIONAL 8 و ADOBE VIDEO TOOLS ی دوا ڤێرژنی بە بەکارهێنەرانی ئەم بەرنامانە بەخشی کەهەندێکیان ئێستا لەبازارەکان هەن و هەندێکیشیان بەم زوانە دەکەونە بازارەکانەوە.




وێنەی (١)

# بەبێ بەرنامەی تایبەت چۆن داتاکانمان دەخەینە سەر سیدی

هێرۆ ئیبراهیم

لای هەمومان ئاشکرایە کە کۆمەڵێک بەرنامەی تایبەت هەن بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە داتاکانمان بخەینە سەر سیدی جا هەر زانیاریەک یان داتایەک بێت گرنگترین ئەم بەرنامانەش بریتیە لە (NERO) کە تاکو ئێستاش بەهێزترین بەرنامەیە بەلام ئێمە دەتوانین ئەم کارە بکەین بەبێ بونی بەرنامەی تایبەت واتە ئەگەر لەناکاو پێویستت بە هەندێک زانیاری دەبێت هەڵیان گریت لەناو سیدی یان ئەوتا بۆ کارێک سیدیەک لە کۆمەڵێک زانیاری ئامادە بکەیت یان من دەمەوێ ئەم بابەتە بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر بنێرم لەسەر سیدیەک بەبێ ئەوەی هیچ بەرنامەیەک هەبێت واتە هەر لەرێگای سیستەمی ویندۆزەکەمەوە دەتوانم ئەم کارە بکەم بەلام پێویستە سیدی رایتەرم هەبێت کە تایبەتە بە کۆپی کردنی سیدی بڕوانە چۆن دوای نوسینی ئەم بابەتە یان تۆ هەر فۆڵدەرێکت هەیە ئەتەوێ بیخەیتە سەر سیدی لەسەرەتادا دەچینە سەر ئەم شوێنەی فۆڵدەرەکەمان تیایدا پاراستوە دواتر کلیک لەسەر ئەو فایلانە دەکەین یان ئەو فۆڵدەرانەی کە دمانەوێ بیانخەینە سەر سیدی، دوای دەست نیشان کردن یەکسەر لە بەشی راستی کۆمپیوتەرەکەت لەژێر (FILE AND FOLDER TASK) چەند ئایکۆنێک زیاد دەبن یەکسەر کیک دەکەین لە (COPY THE SELECTED ITEMS).

(بڕوانە وێنەی ١) (( یان راستەخۆ بە کلیکی راست پاشان فەرمانی (SEND TO) دوایی بۆ بەشی سیدی رایتەر دەنێرین)) پاشان بۆکسێک دەکرێتەوە (بڕوانە وێنەی ٢) یەکسەر دیسکی سیدی رایتەر دەست نیشان دەکەین و کلیک لەسەر (COPY) دەکەین دواتر یەکسەر دەچینە ناو سیدی رایتەرو دەیکەینەوە لەویش لەژێر (CD WRITING TASK) کلیک لەسەر (WRITE THESE FILES TO CD) دەکەین دواتر بۆکسێک دێتە پێش لەویش ناوێک لە سیدیەکە دەنێین دواتر کلیک (NEXT) دەکەین (بڕوانە وێنەی ٣) پاشان یەکسەر هەنگاوەکان دەست دەکەن بە کۆپی کردنی فایلەکان (بڕوانە وێنەی ٤) پاش تەواو بونی ئەوا سیدیەکە دێتە دەرەوە کردارەکەش تەواو دەبێت، بۆ زیاتر زانیار دەتوانین ئەم کرادرە بۆ کۆپی کردنی زانیاریەکان بەکار بێنین لەنێوان دیسکەکانیشەوە وە هەروەها لەنێوان کۆمپیوتەری تریشەوە ئەگەر بەیەکەوە بەسترابنەوە . وە لەم تایبەت مەندیە دەتوانین ئەم سیدیە چەندان جار زانیاریەکانی لەسەر کۆپی بکەین بە بێ تێکچونی سیدیەکە.




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)






هاژە کامەران

دۆس وەکو بەشێک لە سیستەمی ویندۆز کە لە هەموو ڤێرژنەکانی ویندۆزدا هەیە گەلێک فەرمانی گرنگ جێبەجێ دەکات و کار ئاسانی بۆ بەکارهێنەر دەکات لەهەمان کاتیشدا زۆرێک لەکارو فەرمان هەن تەنها بە دۆس دەکرێن وە کردارو فەرمانەکانیشی زۆر خێران لە هەمان کاتیشدا بە کۆڵەکەی سیستەم دادەنرێت، بۆ کردنەوەی دۆس لەسەرەتادا دەچینە فەرمانی کارپێکردن (RUN) لەوێ دەنوسین (COMMAND PROMPT) پاشان ئینتەر دەکەین (بڕوانە وێنەی ١) دواتر بەپێی پێویست ئەم فەرمانانەی خوارەوە لەدۆس جێبەجێ دەکەین بۆ هەر فەرمانێکیش ئینتەر دەکەین :

- DIR بۆ نیشاندانی فۆڵدەرەکانی ناو سیستەم.
- CLS بۆ هێشتنەوەی ڕوکاری دۆس بەبەتاڵی بەبێ هیچ جێبەجێکارییەک.
- MD بۆ دروست کردنی فۆڵدەرێک واتە دوایی ناوی فۆڵدەرەکە دەنوسین کە دەمانەوێ دروستی بکەین بۆ نمونە (MD HAJA) دواتر ئینتەر دەکەین.
- RD بۆ سڕینەوەی فۆڵدەر واتە لەگەڵی ناوی فۆڵدەرەکەی دەنوسین.
- DATE بۆ ڕاست کردنەوەی مێژوو و ساڵنامەی سەر کۆمپیوتەر.
- TIME بۆ ڕاست کردنەوەو ڕێکخستنی کاتژمێری کۆمپیوتەرەکەت.
- LABLE بۆ پیشاندان و گۆڕینی ناو دیسکەکان.
- VOL بۆ پیشاندانی ناو دیسکەکان لەگەڵی هێمای دیسکەکە دەنوسین (:D: E: F ....)
- VER بۆ زانینی جۆری سیتەمەکەت واتە (XP، ME، 98 ....).
- FORMAT C بۆ فۆرمات کردن و سڕینەوەی زانیارییەکانی ناو ئەم دیسکە.
- TYPE بۆ نیشاندانی ئەو فایلانەی کە لەشێوەی دەقن.
- DEL بۆ سڕینەوەی فایلێکی دیاری کراو.
- REN بۆ دوبارە ناو لێنانی فایلێک.
- COPY بۆ لەبەرگرتنەوە (کۆپی کردن).
- PROMPT بۆ گۆڕینی دیسکی سەر دۆس بۆ نمونە لە (C) بیگۆڕین بۆ (D) لەگەڵی هێمای قورسی مەبەستدار دەنوسین
- XCOPY بۆ کۆپی کردنی ئەو فۆڵدەرانەی کە چەند فۆڵدەرێکی تریان تێدایە.
- DEFRAG بۆ جێبەجێکردنی دیفراگ مێنت.
- SCANDISK بۆ پشکنینی کۆمپیوتەر لە هەر هەڵەیەک.
- UNDELET بۆ گەڕاندنەوەی فایلەکانی سڕاوە بەو مەرجەی یەک هەفتەی پێنەچووبێت.
- FIND بۆ دۆزینەوەی فایلێک یان فۆڵدەرێک.
- MSBACKUP بۆ دروست کردنی باک ئەپ بۆ زانیارییەکانی ناو کۆمپیوتەر.
- MEM نیشاندانی زانیارییەکانی ناو ڕام.
- CD بۆ پەڕینەوە لەنێوان فۆڵدەرەکان.

# کرمی سوبەری بەهێز Sober دیسان دەبێتە بەربەستێکی زۆر بەتوانا

ئا: سازان رزگار

بەم دواییە زانایان دەریان خست کەبەم دواییە بەهێزترین ڤایرۆسی تێکدەر بەناوی SOBER هاتۆتەدنیاوە بۆتێکدانی ئامێرەکانی ئەلیکترۆنی بەتایبەتی کۆمپیوتەر یەکێک لەسیفاتە سامناکەکانی ئەم ڤایرۆسە کەدوچاری نامەو ئیمێڵەکان دەبێتەوە تەنها تێکیان نادات بەڵکو هەرلەناویان دەبات واتا ئاسەواریشیان ناهێڵێت لەناو کۆمپیوتەر ئەم جۆرە ڤایرۆسە بە بەهێزترین جۆرەکانی دادەنرێت لەساڵی ٢٠٠٥ لەجیهان لێکۆڵینەوەیەکی زۆرکرا بۆراگرتنی ئەم تێکدەرە لەکۆتایدا خەبەری خۆشمان وەرگرت لە کۆمپانیای پاراستن (F-SECURE) بەدۆزینەوەی دژەڤایرۆس کەئێستا خەریکی دروستکردنی ئەم دژەڤایرۆسەن بنچینەی دروستکرنی ئەم تێکدەرەش حزبی(نازی)ە لەئەڵمانیا وەک لەساڵی ٢٠٠٣ دیسان ئەم ڤایرۆسەیان خستە جیهان و ٣٠ دانەیان بەگرانترین نرخ فرۆشت.

McAfee®
System Protection
Industry-Leading Intrusion Prevention Solutions
McAfee® System Protection
Industry-Leading Intrusion Prevention Solutions
McAfee® Entercept®
Database Edition
Security you can Trust

# ڤایرۆسێکی ترسناک


نبیل عبدالرزاق


تۆڕەکانی هەواڵی جیهانی CNN بڵاویان کردەوە لە ڕێگەی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت کەوا ترسناکترین ڤایرۆس لە مێژووی سەرهەڵدانی ڤایرۆس دەرکەوتووە، ئەم ڤایرۆسە کۆمپانیای (مکافی) بۆ لەناوبردنی ڤایرۆس ئاشکرای کردووە.

ئەم ڤایرۆسە ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر بەشەکانی هارد و لەناوی دەبات، کاردەکاتە سەر ناوچەی صفر لە هارد، ئەم بەشە لێپرسراوە لە سیستەمی دۆس، لە ناوبردنی ئەم ناوچەیەش دەبێتە هۆی لە ناوچوونی هارد بە تەواوی، ئەم ڤایرۆسە نامە دەنێری بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەوا ناویان هەیە لە لیستی پۆستەیی خۆت لەسەر ناونیشانی A CARD FOR YOU.

کاتێک نامەکە دەکەیتەوە ئەوا کۆمپیوتەرەکەت لە کارکردن دەوستێت و ڤایرۆسەکە دەست دەکات بە چالاکی خۆی، کۆمپانیای مایکرۆسۆفت ئاگاداری خۆی بڵاوکردۆتەوە کەوا هەرچی نامەی هاتوو هەبێت لە ناو پۆستی ئەلیکترۆنی خۆت نەیکەیتەوە ئەگەر لە ژێر ناونیشانی A VIRTUAL CARD FOR YOU ئاگادار بە هەر نامەیەکت بۆ هات ئەگەر کەسی نێرداریشت ناسی نەیکەیتەوە.




# کاری وەرگێڕان لە وۆردی ئێکس پی

## ئاڤێستا کاردۆ

یەکێک لەبەهێزترین بەرنامەکان و ئاسانترین و پێویسترین بەرنامەی رۆژانەی گشت کەس و فەرمانگەکان و کۆمپانیاکان و هەموو نوسەرو هەموو ئۆرگانەکانی راگەیاندن بریتیە لە مایکرۆسۆفت وۆرد کە بریتیە لەبەرنامەکانی هۆکاری داخل کردنی زانیاریەکانە بۆ ناو کومپیوتەر لەرێگای نوسین، ئەم بەرنامەیە لەپاڵ ئەوەش کە کاری نوسینە، دەتوانێت بەکاری نەخشەسازی فەرمانگەکان و وێب سایت و زۆر نەخشەو دیزاینی تر هەڵدەستێت جگە لەمەش دەتوانرێت چەندان کرداری تری پی ئەنجام بدرێت لەناویاندا کاری وەرگێڕان، لەرێگای وۆردی ئێکس پیدا دەتوانێت وشەی ئینگلیزی یان هەر زمانێکی یان وڵاتێکی تر کەوا هاوبەشیان کردوە لەگەڵ ئەم بەرنامەیەدا دەتوانێت بۆ سەر ئەم زمانە وەری گێڕیت جگە لەمەش ئەم بەرنامەیە زۆر دەوڵەمەندە بە مرادفات و چەندا وشەی بەرمامبەری خۆی . بۆ هەنگاوەکانی ئەم بەرنامەیەش لەدوای نوسینی پەرەگرافەکە کلیکی راست دەکەین لەناو پەرەگرافەکە مەبەست ئەو پارچەی کەنوسیومانە دوایی (TRANSLATE) هەڵدەبژێرین (بروانە وێنەی ١) راستەوخۆ دوای کلیک کردن بۆکسێک لەبەشی راستی بەرنامەکە دەردەکەوێت، لەژێر (TRANSLATE WHAT) شیوازی وەرگێڕان دەست نیشان دەکەین وە لەژێر (LOOK UP IN DICTIONARY) دەست نیشانی زمان و جۆری وەرگێڕان دەکەین کە مەبەستمانە وشەکە لەبەرامبەر ئەو وشەی وڵاتە بەچ مانایەک دێت . ئەگەر مەبەستمان وەرگێڕانی وشەو بێی ئەوا (TEXT) هەڵدەبژێرین، ئەگەر ویستمان تەنها ئەو وشانەی دەست نسشان دەکەین وەریان گێڕێت ئەوا (CURRENT SELECTION) هەڵدەبژێرین، بەڵام ئەگەر ویستمان تەواوی پەرەگرافەکە وەرگێڕین ئەوا (ENTIRE DOCUMENT) هەڵدەبژێرین پاشان کلیک لەسەر (GO) دەکەین وەک لەوێنەی ژمارە (١) دیارە، بەم شێوەیە دەتوانین کرداری وەرگێڕان لە وۆردی ئێکس پی جێبەجێبکەین.

# مەبەست لە ترۆجان چیە TROJAN




شێرزاد محمد/ سلێمانی

لەسەرەتادا ئەبێ ئەو راستیە بزانین کە ڤایرۆس تێکدەرو لەناوبردنی سیستەمی کۆمپیوتەرە لەهەمان کاتدا هەموو ئەو بەرنامانەش کە هەمان کاری ڤایرۆس دەکەن دەچنە ریزی ڤایرۆسەکان ئینجا ئەگەر گوێبیستی وشەی ترۆجان بویت (TROJAN) ئەوا وشەیەکە مانای سێرڤر SERVER و پاتش PATCH و تەجەسس و SPY و برین و دزین دەگرێتەوە واتە هەمویان فایلی تەجەسسن وە هیچ جیاوازیەکیان نیە مەگەر ئەوکەسانەی کە کاری پارێزەر لەسیستەمەکان دەکەن وەهەمویان یەک ئامانجیان هەیە ئەویش تەجەسس و لەناوبردن و تێکدانی کۆمپیوتەرەکانە بەلام ترۆجانەکان بریتین لە فایلاتی خزمەتکارو نێوان بۆ کار ئاسانی بۆ گەیشتن بەکۆمپیوتەری کەسانی ترو دەست کردن بەکاری نایاسایی لەناو کۆمپیوتەری توشبو و پەک خستن و دزینی زانیاریەکان .

ڕێگاکانی توشبون بە ترۆجان لەرێگای گفتوگۆکردنی راستەوخۆ واتە چاتکردن بەتایبەتی(MICROSOFT CHAT و ICQ وMIRC و MSN وYAHOO) تا دوایی بۆیە باشترین ڕێگە چارە بریتەی لە پێشوازی نەکردن لە هەر فایلێک لەرێگای چاتکردن کە پاشبەندەکەی بریتی بێت لە EXE هەمان کاتدا بەرنامە هەیە کە وێنە دەگۆرێت واتە وێنە دەنێرن کەسەکەش بەناوی وێنە وەردەگرێت کەچی دواتر ئەو وێنەوەیە ترۆجانە دواتر کاری خۆی لەناو کۆمپیوتەر دەکات .ڕێگایەکی تری توش بون بریتیە لە پۆستی ئەلیکترۆنی واباشە هیچ نامەیەک نەکەینەوە کە سەرچاوەکەی نەزانراوە واتە دەبێت یەکسەر بیسڕینەوە بەبێ کردنەوە، یان ئەوەتا ئەم ترۆجانە لەرێگای هەڵدانەوەی پەڕەکانی وێب و دابەزاندنی بەرنامە دەبێت کەزۆر جار ئەم بەرنامانە بەم جۆرە ترۆجانە هەلگیراون و کۆمپیوتەرەکەت توش دەبێت وە یەکسەر بەرنامەکە دەچێتە STARTUP واباشە بەردەوام بەئاگا بیت لە بون و چالاکی بەرنامەکانی پاراساتنی کۆمپیوتەرەکەت مەبەست لە دژە ڤایرۆسە هەروەها باشترینیان برتیە لە NORTON ئەوەی شایەنی باسە پر مەترسیترین ڕێگاکانی چاندنی ئەم ترۆجانانە لەرێگای چات کردنی کۆمپیوتەرو دابەزاندنی بەرنامەکانە لەرێگای ماڵپەری نەناسراوو گوماناوی بۆ ئەوەی ئێمە لەم شتانە دور کەوینەوە پێویستە بەرنامەی پارێزەری چالاکمان هەبێت ئینجا بەرنامە لەئەنتەرنێت دابەزێنین، لەگەل ئەوەشدا زۆربەی ئەو سیدیانەی بەرنامەن هەولبدەین ئۆرجینال بن واتە دانەی ئەصلی بن و کۆپی نەکرابن تاکو لەم مەترسیانە بەدوربین.




# نەخشەیەک بۆدیاری کردنی راژەی هەژاری

ئا: ئاغایێ رۆستەمی

بەم دواییە وولاتی فلیپین هەستا بەدروستکردنی نەخشەیەک بەناوی (LEYTE) بۆ دیاری کردنی راژەی هەژاری لەوولاتەکەی بەمەش هەموو جیهان ئەمەیەیان قوستەوە بۆئەوەی نەخشەیەک بکیشن لەجیهان هەموو هەژارەکان دیاربکەن بۆکەمکردنەوەی راژەی هەژاری ئەم نەخشەیە کەبەبەرنامەی ئارک ڤیو ٩ (ESRI ARCVIEW 9.0) ئیستا لەسەر ئەنتەرنیت راگەیاندراوە لەسایتەکان بۆزانیاری زیاتر HTTP://WWW.PIA.GOV.PH.NEW.ASP?FI=P060116.HTM&NO=17




# بڕۆکسی چییە؟

گۆران شەقڵاوەیی
gorankumar@yahoo.com

بڕۆکسی ئەو ووشەیەی کە بووەتە هۆی باس و خواسی نێوان بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت، دەبا بزانین مانای چییە ؟ وە شێوەی کارکردنی چۆنە ؟ وە بۆچی بەکاردەهێنرێت ؟ وە پەیوەندی چییە لەگەڵ هەڵبژاردەی سایت و چالاک کردنی ؟

ئەوەی زۆر گرنگە کە بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت بیزانن ئەوەیە، کەوا بڕۆکسی بریتیە لە خزمەتکاری زانیارییەکان یاخود خزمەتگوزاری کردن، کە کاردەکات لە نێوان بەکارهێنەرانی تۆڕو ئینتەرنێت، ئەویش بەوەی کۆمپانیا گەورەکان پیشەکیەک وەردەگرن بۆ خزمەتگوزاری پەیوەندی ئینتەرنێت، ئەمیش بۆ زامن بوون و بەردەوام بوونی ئیدارە کردنی تۆڕەکە، وە کۆنترۆڵ کردن بەسەریدا، وە زامن بوونی ئاسایشی هێڵەکە، وە دابین کردنی خزمەتگوزاری زاکیرەی کاش میمۆری، وە بڕۆکسی کار دەکات لەگەڵ کۆکەرەوەی پۆرتەکان، ئەمیش بە دابڕینی هێڵی دام و دەزگاکان لەگەڵ هێڵی دەرەوە، هەروەها کاردەکات وەکو دیواری ئاگرین (FIRE WALL)، کە دام و دەزگاکان دەپارێزێ لەهەر تێکدانێکی دەرەکی بۆ ناو تۆڕەکە، بڕۆکسی فەرمان وەردەگرێ لە بەکارهێنەری ئینتەرنێت، لەکاتی داواکردنی کردنەوەی لاپەڕەیەکی تۆڕ، وە لەم کاتەدا ئەم کارانە ڕوودەدەن.

داواکاریەکە بەنێو چەند کارتێکی داواکراو تێدەپەڕێت، وە بڕۆکسی کاردەکات وەکو کۆکەرەوەیەکی کاش، ئەمیش بەهۆی ئەوەی بەدوای لاپەڕەی داواکراو دەگەڕێت لە کاشی نێوخۆییدا، بۆ بەدەست کەوتنی ئەنجامی ئەوەی کە ئایا ئەم لاپەڕەیە جارێکی تر دابەزێنراوە یاخود نا، ئەگەر دابەزێنرابوو بێ گومان، ئەوا بۆ بەکارهێنەر دەگەڕێنێتەوە، بێ ئەوەی پێویست بە ناردنی داواکاریەکە بکات بۆ تۆڕی جیهانی، بەڵام ئەگەر کۆکەرەوەی بڕۆکسی ئەم لاپەڕەیەی نەبینیەوە لە کاشدا، ئەوا لەم کاتەدا کاردەکات لەسەر ناردنی داواکاریەکە بۆ تۆری جیهانی IP، ئەمیش بەوەی یەکێک لەناونیشانەکان بەکاردێنێ کاتێک لاپەڕەکەمان بەدەست دەگات لەناو تۆڕدا، وە بڕۆکسی هەڵدەسێ بە هاوپێچ کردنی ئەو داوایەی کە بەکارهێنەر داوای کردبوو لە پێشتردا .

وە لەگرنگترین کارەکانی بڕۆکسی ئەوەیە، کە ئەو کاشەی هەیەتی دەتوانرێ خزمەت بکات بە هەموو بەکارهێنەران، ئەگەر ئەو سایتەی داوای دەکەیت خوێنەرێکی زۆری هەبوو، وە بەکارهێنەرێکی زۆر سەردانی دەکەن، لەماوەی کاتێکی دیاریکراو، ئەوا بڕۆکسی لە کاشەکەیدا هەڵدەسێ بە کۆگە کردنی کۆپیەک لەم سایتەدا، لەبەرئەوە کاردانەوەی داواکاری بەکارهێنەر کە داوای ئەم لاپەڕەیەی کردووە خێرا دەبێت، بەبێ ئەوەی پێویست بەناردنی داواکاریەکە بکات بۆ ئینتەرنێت دووبارە، ئەمەش دەبێتە هۆی گەڕانەوەی کاتێکی زۆر بۆ بەکارهێنەر، وە کاری کۆکەرەوەو دیواری ئاگرین وە کاری کاش ئەنجام دەدرێ بە هۆی چەند بەرنامەیەکی سەربەخۆ، وە ئەم بەرنامانە دەکرێ لەسەر چەند کۆمپیوتەرێکی جیاواز بێت، یاخود دەتوانرێ کۆبکرێتەوە لەیەک ئامێردا، واتە بڕۆکسی و دیواری ئاگرین دەتوانرێ کۆبکرێنەوە لەیەک ئامێردا، یاخود هەر ئامێرەو تەرخان بکرێت بۆ یەکێکیان، کە لەدواییدا داواکاریەکان ئاڵوگۆڕدەکرێن لە نێوانیاندا .

لە کۆتاییدا دەڵێین کۆکەرەوەی بڕۆکسی کاردەکات بە شێوەیەکی نادیار، واتە داواکاریەکان و کاردانەوەکان بەدیار دەکەون وەکو ئەوەی گرێ درابن لەگەڵ ناونیشانی پێویستی داواکراو، وە لەسەر بەکارهێنەرە بۆ ئەوەی زامنی پەیوەندی بکات لەگەڵ تۆڕدا، لەپەر هەڵدەرەوەکەی خۆیدا ناونیشانی تایبەتی بڕۆکسی دیاری بکات، وە بە نیسبەت فلتەرکردنی سایتەکان ئەمەیان کاری سەرەکی بڕۆکسی نییە، بەڵام بە پەیوەندی لەگەڵ چەندین بەرنامەی تر وە بنکە زانیارییەکان، دەتوانرێ ڕێ لە بەکارهێنەر بگرێت لە دەرنەخستنی هەندێ سایت، بە پێی چەند بنەمایەکی سەرەکی، وە لەبەر چەندین هۆکاری جیاواز .

# ئایا ڕاستە مایکرۆسۆفت سیخوڕی دەکات بەسەر بەکارهێنەرانی ویندۆز؟

بــاوکی مــاریا - شەقڵاوە
Kameran7605@yahoo.com

ئــازیــزان.. ئــەوەی ئاشکراو ڕوونـە لای هەمووان ئەوەیە، کەوا بەرنامەی ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر هەڵدەسێ بە کۆگە کردنی لاپەڕەکانی سایتەکان، کە تۆ سەردانیان دەکەیت، لە فۆڵدەرێکدا بــە نــێوی TEMPORARY INTERNET FILES (TEMP)، لە شێوەی مەلەفی کاتی، وە بەکارهێنەرانی سیستەمی ویندۆز هەڵدەسن بە لابردنی شـەم مەلەفانە، بۆ بزرکردنی ئەو لاپەڕانەی سەردانیان کردووە لە بەرچاوی خەڵکانی تر، بەڵام ئایا بەڕاستی ئەم زانیاریانە بزردەبن، تەنها بە سڕینەوەیان؟

لە وەڵامدا دەڵێین ئەوەی ڕاستی بێت ئەم زانیاریانە بزرنابن، چونکە چەند مەلەفێک هەن کە هەڵدەسن بە ئەرشیف کردنی هەموو ئەو سایتانەی کە سەردان کــراون، ئـەم مـەلـەفـانـەش بـە تـەواوی نادیارن لە بـەرچاوی بەکارهێنەر، وە بەهیچ شێوەیەک ناتوانیت بیدۆزیتەوە بە بەکارهێنانی ڕێگاکانی گەڕانی تەقلیدی، وەکـو فـەرمـانـی گـەڕان لـەناو ئامێری کۆمـپـیـوتـەر، وە بـۆ سـڕیـنـەوەی ئـەم ئەرشیفە هەڵسە بەم کارەی خوارەوە:-

هـەڵـسـە بـەکـردنـەوەی فـۆڵـدەری TEMPORARY INTERNET FILES کە لەناو فۆڵدەری WINDOWS دایـە، وەدەسـت بکە بە لابردنی واتـە ڕەش قردنەوەی هەموو ناوەڕۆکەکەی، پاشان بـڕۆ بۆ (WINDOWS EXPLORER) وە لەم شوێنەدا هەمان فۆڵدەر بکەرەوە، تێبینی دەکەیت فۆڵدەرێک هەیە بە نێوی CONTENT.IE5 وە ئەم فۆڵدەرە چەند فۆڵدەرێکی تری تیایە بۆ نمونە بەنێوی S7E56J8H و HY3709 و WAK5Q8AR وە ئـەم ناوانە دەگۆڕێن لە ئامێرێک بۆ ئامێرێکی تر، بـەڵام ئـەم نـاوانـە بەرپرسیارن لە زاکیرەی کاش لە بەرنامەی ئینتەرنێت ئێکسپلCرەر، وە لەکاتی کرانەوەیان وا دیارن کەبەتاڵن، ئێستا ئێمە کارەکەمان تـەواو بوو لەناو ویندۆز وە بەشەکەی تری تەواو دەکەین لە ڕێگەی دۆسەوە، دەست بکە بەچوونە نێو دۆس، یاخود بەکارهێنانی دسکی STARTUP وە بڕۆ بۆ ئەم ڕێرەوە C:\WINDOWS\TEMPOR~1\CONTENT.IE% هەڵسە بە پیشاندانی نـاوەڕۆکـەکـەی لـەڕێی فـەرمـانـی DIR تێبینی دەکەیت مەلەفێک هەیە بە نێوی INDEX.DAT وە ئەم مەلەفە ئەرشیفێکی تەواوی تیایە دەربارەی ناونیشانی ئەو سـایـتـانـەی ســەردان کــراون، هەڵسە بەکردنەوەی ئەم مەلەفە بە نووسینی فەرمانی EDIT، تێبینی دەکەیت هەموو ناونیشانەکان لێرەن، لێرەوە هەڵسە بە سڕینەوەی هەموو ناونیشانەکان یاخود ڕەش کـردنـەوەی مـەلـەفـەکـە، لەڕێی فەرمانی DEL، بەڵام لەکاتی پێکردنەوەی ئامێرەکە ئەم مەلەفە دروست دەبێتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی بەتاڵ، وە دووبارە دەســت دەکـاتــەوە بـە تـۆمـارکـردنـی ناونیشانی سایتە سەردان کراوەکان، وە لەڕێگەیەکی ترەوە دەتوانین ناوەڕۆکی مەلەفی INDEX.DAT ڕەش بکەینەوە لەناو ویندۆز، ئەویش بە پێکهێنانی مەلەفێکی باتش بەم شێوەیە :—

هەڵسە بە کردنەوەی بەرنامەی NOTE PAD وە ئەم فەرمانەی تیا بنووسە واتە کۆدەکەی DELTREE/ Y C:\WINDOWS\TEMPOR~1*.*CLS، وە هەڵسە بەکۆگە کردنی ئەم مەلەفە بەسیفەت و پاشگری (BAT)، وە لەکاتی کارپێکردنی ئەم مەلەفە هەڵدەسێ بە ڕەش کردنەوەی ناوەڕۆکی مەلەفی INDEX.DAT.

وەبۆ کەشف کردنی زیاتری ئەم جۆرە مەلەفانە، دەتوانی بەرنامەی SPIDER بەکاربهێنی کە بەتایبەتی دروستکراوە بۆ ئەم کارە، وە دەتوانی ئەم بەرنامەیە دابـەزێـنـی لـە سـایـتـی W7W.FSM.NL/WARD





# هەڵسەنگاندنێک بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر

لەگەڵ ئەوەی گۆڤاری کۆمپیوتەر تاکە گۆڤاری تایبەتە بەزانستی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت کە وەزارەتی ڕۆشـــنبیری لەشاری هەولێر دەردی دەکات. تاکو ئێســـتا (٨) ژمارەی لێ کەوتۆتە بازاڕەوە جگە لەوەش لە ســـایتی ئەنتەر نێت دەتوانرێت بیخوێنرێتەوە، ئەمەو ئەم گۆڤارە نەک هەر لەناو شـــاری هەولێر بەڵکو لەشـــارەکانی دیکەی کوردســـتان خەڵک پەرۆشن بۆی .بۆیە بەپێویستمان زانی بۆ هەڵسەنگاندنی گۆڤارەکەو بۆ زانینی ڕێژەی داواکاری و ئـــارەزووی خەڵکی بۆ گۆڤارەکە ڕووی پرســـیار لەو نوســـینگەو ڕۆژنامە فرۆشانە بکەین کە گۆڤارەکەمانی تێدا بڵاودەکرێتەوەو دەفرۆشرێ.

ڕیپۆرتاژ: ڕێناز ئەردەلان بەکر
فۆتۆ : هێرش ئیسماعیل



**سەرەتا بەڕێز ئەحمەد عبدلقادر دەڵێت:**

گۆڤاری كۆمپیوتەر لەچاو گۆڤارەكانی تر زۆر باوە خەڵـك زۆر داوای دەكەن لەبازار زۆر دەفرۆشرێ، جگە لێرە لەشاری سلێمانی زۆر داوای دەكەن كە بۆخۆی ( ٣٠٠ ) دانەیان بۆ دەچێ داوا دەكەن بكرێتە ( ٥٠٠ ) دانە هەروەها بۆشارەكانی وەك دیانەو كەركوك و دهۆك دەچێت .بۆیە ئێمەش داوا دەكەین تیراژی گۆڤارەكە زیاد بكرێ بۆئەوەی بەگوێرەی داواكاریەكانی خەڵك بێت.

**بەڕێز ئومێد سلێمان عەباس خاوەنی پەڕاوگەی كاوان دەڵێت:**

سەبارەت بەگۆڤاری كۆمپیوتەر گۆڤارێكی زۆر چاكە و بابەتەكانی زۆر بەسودن، خەڵكێكی زۆر سودی لێ وەرگرتوەو ڕەواجێكی زۆری هەیە ڕۆژانە خەڵكی زۆر دەپرسن بۆی، بەڵام تیراژی كەمە داواكارین زیاد بكرێ بۆئەوەی بەتەواوی بگاتە دەست هاوڵاتیان و خوێنەرانی گۆڤارەكە.


ئومێد سلێمان

**بەڕێز سەركار ڕەفعەت ڕۆژنامە فرۆش دەڵێت:**

گۆڤاری كۆمپیوتەر تارادەیەكی زۆر باش جێگای خۆی كردۆتەوە لەناو هەموو گۆڤارەكان. زۆر پێشكەوتوە لە هەموو گۆڤارەكانی تر زیاتر دەفرۆشرێ بەماوەیەكی كەم نامێنێ هیواداریـن تیراژی زیاد بكرێت.


سەركار ڕەفعەت

**بەڕێز سیروان ڕۆژنامە فرۆش گووتی:**

سەبارەت بەگۆڤاری كۆمپیوتەر گۆڤارێكی زۆر باشە دەست خۆشی لە ستافی ئەم گۆڤارە دەكەم، بەڕاستی دەتوانم بڵێم لەهەموو گۆڤارەكانی تر ئارەزووی لەسەرە،چونكە لەم سەردەمە سەرچاوەی هەموو شتێك كۆمپیوتەرە .گۆڤارەكە ڕێژەیەكی زۆر لە گەنجان و قوتابیانی زانكۆ و پەیمانگاكان و بگرە





سیروان

فەرمانبەران روو لەکڕینی دەکەن .لەلای خۆمەوە من لەگەڵ هەڵەبجەو سەید صادق بەشداریم کردوە بۆگۆڤارەکە

هیواشم وایە گۆڤارەکەتان تیراژی زیاد بکرێ،چونکە ئەگەر ژمارەی کەم بێ نرخەکەی بەرز دەبێ هەندێک گۆڤار هەیە دەتوانم بڵێم بە خۆرایی دەردەچێت و هیچ سودێکی نیە بۆیە ئەو خەرجیەی لەم گۆڤارانە دەکرێ بخرێتە سەر گۆڤاری کۆمپیوتەر باشترە بۆئەوەی خوێنەرانی ئەم گۆڤارە لێ بێ بەش نەبن .

**بەڕێز زریان عبدلقادر خاوەنی نوسینگەی کوردستان دەڵێت :**

لەچاو گۆڤارەکانی تر ڕەواجێکی زۆری هەیە داواکارین ئەگەر بکرێ تیراژی زیاد بکرێ، چونکە تیراژی کەمە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵک داوای دەکەن تاکو ئێستا لەهەموو گۆڤارەکانی تر باشترە جگە لەقوتابیان خەڵکی ئاسایش زۆر ئەم



زریان

گۆڤارە دەکرن .وای لێ هاتووە بەر لەدەرچوونی خەڵکی زۆر پرسیا دەکەن و چاوەڕێ دەرچوونی دەکەن نەک تەنیا




شەمال

لێرە بەڵکو لەشارەکانی تریش .داواشمان وایە هەروا بەبەردەوامی دەربچێ دوا نەکەوێ لەکاتی دەرچوونی چونکە خەڵک و خوێنەرانی زۆر بەپەرۆشن بۆی .

**بەڕێز شەماڵ عبدلقادر خاوەنی نوسینگەی برایەتی گوتی :**

سەبارەت بەگۆڤاری کۆمپیوتەر ئائێستا لەهەموو کوردستان بەتایبەتی لەهەولێر بەباشترین گۆڤار دادەنرێ. چونکە خەڵکێکی زۆر داوای کڕینی دەکات،بەڵام ئێمە گلەیەکمان هەیە کاتی دەرچوونی دیار نیە ئەگەر دیاری بکەن زۆر باشە ڕاستە مانگانە دەردەچێ بەڵام چەندی مانگ دەردەچێ دیاری بکرێ زۆر باشە تیراژەکەشی هیوادارین زیاد بکرێ چونکە خەڵکی زۆر لەشارانی تریش داوای دەکەن بەتایبەتی لەشاری سلێمانی زۆر داوای دەکەن ئەو ژمارەی بۆیان دەچێ زیاد بکرێ .



# ئەوانەی شێوەیان لە تۆ دەچێت؟

سەلیم عبدالعزیز جمیل
freeman_sd20@yahoo.com










وێنەی (١)

بۆ ئەوەی بزانی کێ شێوەکەی نزیکە لە تۆ بە ڕێژەی سەدی ئەوا سایتی WWW. MYHERITAGE.COM دەکەیتەوە پاشان دوگمەی BETA CENTER هەڵدەبژێرین (سەیری وێنەی ١) بکە، ئێستا ماڵپەڕێکی تازە دەکرێتەوە چەندین هەڵبژاردەی تێدایە تۆ کلیک لە سەر دوگمەی TRY IT NOW (سەیری وێنەی ٢) بکە، ئێستا بۆ کردنەوەی وێنەکەو دانانی لە ناو سایتەکە کلیک بکە لەسەر دوگمەی BROWSE بۆ ئەوەی وێنەکە بەراورد بکات لەگەڵ ئەو کەسانەی شێوەیان لە تۆ دەچێت چ لە روخسار چ لە شێوەی وێنە گرتنە کە دوگمەی RUN FACE RECOGNITION (سەیری وێنەی ٣) بکە، بەلام کاتێک ئەم هەنگاوە ئەنجام دەدێت یەکسەر بۆت جێبەجێ ناکات بەڵکو پێویستە لیستی تایبەت بە پەیوەندی کردن لەگەڵ

Try it now!

Try our exciting face recognition demo now. Upload a photo and let MyHeritage.com recognize who's in it.

وێنەی (٢)

Home | Products | Genealogy | Community | Search | Support | About us

MyHERITAGE

**Face recognition demo**

1 Upload a photo: [Browse...]

Tip! For best results, upload a photo with high resolution, where the faces are clear and in focus; front facing photos work best; color and black & white work fine

2 Pick the face database to use for face recognition

MyHeritage family sites
MyHeritage Celebrity database
All databases

Tip! Faces of the world's 3,700 most famous men and women

3 **Run Face recognition!**

وێنەی (٣)

سایتەکەدا بکەیتەوە ئەویش پێوستی بە پۆستی ئەلیکترونی چەند زانیاریەکی تر هەیە بۆ ئەم مەبەستەش کلیک لەسەر دوگمەی SIGN UP دەکەین (وێنەی ٤)، پاش تەواو کردنی بەشداربوون دووبارە پێویست دەکات ئەدریسی پۆستی ئەلیکترۆنی و ووشەی نهێنی خۆت بنووسیت سەیری هەمان وێنە بکە.

ئێستا چاوەڕێ بکە تاوەکو وێنەی هاوشێوەی خۆت دەدۆزێتەوە، ئەویش بە نزیکەیی ڕێژەی سەدی، (وێنەی٥) هەروەها دەتوانی ئەم دوو نیشانە بچووکەی ژێر وێنەی لێک چوو بەکار بهێنی بۆ دیتنی وێنەی تر.



وێنەی (٥)

Not a member yet? Register now.
Sign me up
Already a member? Log in here.
Email:
Password:
Why sign up?

وێنەی (٤)

# ماڵپەرەکانی فێرکردن

هامنۆ عبدالله

ئامانجەکانی گۆڤاری کۆمپیوتەر بریتیە لە خزمەت گەیاندن بە هەموو تاکە کانی ناو کۆمەڵی کوردستان مەبەست بەهەموو ئەو کەسانەی کە تامەزرۆی فێربون کارکردنن لەناو کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی ئەنتەرنێت، لەم روانگەشەوە تا ئێستا درێغی نەکردوە وە هەوڵی تەواویشی داوە من وەکو گەنجیک کە لەسەرەتاوە یەکە یەکەی ژمارەکانم خوێندوتەوە گەیشتیمە ئەو راستیەی کە بەڵی ئەم گۆڤارە دەتوانێت دڵی هەموو گەنجیک روحی هەموو فێرخوازێکی کومپیوتەر و ئەنتەرنێت و بەرنامە سازی تێر بکات، منیش بۆ ئەم ژمارەیە کۆمەڵێکی ئەو ماڵپەرانە دەبەخشم و وەک دیاریەک بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر لەویش بۆ ئێوەی فێرخواز هیوادارم بتوانن سودیان لێوەربگرن . بتوانن لێوەی فێری هەموو ئەو بەرنامەو کردارو هەنگاوەکانی کارکردن بن لەناو هەموو بەرناه ەکان.

### تایبەت بە بەرنامەکانی فلاش

HTTP://WWW.ALMOSAMEM.NET
/HTTP://INTERNET.FARES.NET/AR
HTTP://ALQA3A.VIRTUALAVE.NET/LEARN/FLASH.HTML
/HTTP://WWW.DROS.8M.NET
/HTTP://WWW.FLASH2ARAB.COM
/HTTP://WWW.UAEMAG.WS/MAG
HTTP://WWW.IFAWAL.COM/AR
HTTP://WWW.ALMASTAR.F2S.COM/VB
HTTP://WWW.NOORAH.COM
HTTP://WWW.PINOY7.COM/DEFAULT.HTM
/HTTP://MYPAGE.AYNA.COM/BBSHEER
HTTP://WWW.HELP4FLASH.COM
HTTP://WWW.KIRUPA.COM

### تایبەت بە بەرنامەی فرۆنت پەیج

/HTTP://WWW.QATARDR.NET/DRNET
HTTP://WWW.ALMOSAMEM.NET
/HTTP://DES4ARAB.COM
/HTTP://INTERNET.FARES.NET/AR
/HTTP://WWW.B2SP.NET
/HTTP://WWW.LIMOSITE.NET
HTTP://WWW.DROS.8M.NET

### تایبەت بە جاڤا

/HTTP://MYJAVA.CJB.NET
/HTTP://DOOOL.CJB.NET
/HTTP://DES4ARAB.COM
HTTP://INTERNET.FARES.NET/AR
HTTP://WWW.BLADE4ARAB.F2S.COM/INDEX-BLADE.HTML
/HTTP://MYJAVA.CJB.NET
/HTTP://DOOOL.CJB.NET
/HTTP://DES4ARAB.COM
/HTTP://INTERNET.FARES.NET/AR
/HTTP://WWW.DROS.8M.NET




### تایبەت بە بەرنامەی فۆتۆ شۆپ

HTTP://WWW.ALMOSAMEM.NET
/HTTP://ARTISTTOOLS.VIRTUALAVE.NET
/HTTP://INTERNET.FARES.NET/AR
/HTTP://WWW.LIMOSITE.NET
/HTTP://WWW.KHALAAD.NET
/HTTP://WWW.ALMOSMEM.COM/OTB9
HTTP://MYPAGE.AYNA.COM/ABOANAS11/PSDSCHOOL.HTM
HTTP://WWW.DROS.8M.NET

### تایبەت بە سردی ماکس ستۆدیۆ

/HTTP://WWW.ABOBADR.NET

### تایبەت بە مایکرۆسۆفت ئۆفیس

HTTP://WWW.OOFF.ITGO.COM/AMAIN.HTM
HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/07OFFICE.HTM
HTTP://WWW.OOFF.ITGO.COM/AMAIN.HTM

### بەرنامەی تر

HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/INDEX.HTM

### فێرکردن و راڤەکردنی بەرنامەکان

HTTP://WWW.ARABSGATE.NET/VB/FORUMDISPLAY.P...
PHP?FORUMID=17
HTTP://OMAR.G2GM.COM/EXPLANATION
HTTP://WWW.3FIF.COM/EVILLAGE
HTTP://WWW.GEOCITIES.COM/SALFAIZ/LESSON.HTM
HTTP://WWW.ABOFARS2002.F2S.COM/PROGRAMSHOW.
HTM
HTTP://WWW.ARABIA.BARRYSWORLD.NET/PROGLEARN.
HTM

### بەرنامەکانی پاراستن

HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/01HMAEH.HTM

### بەرنامەی ئەنتەرنێت

HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/04INTERNET.HTM

### دیزاین و وێنە

HTTP://MOOJ3.JEERAN.COM/03RASMTASMEEM.HTM

### باشترینماڵپەڕەکانی باک گراوند

/HTTP://WWW.SHIFTEDREALITY.COM
HTTP://WWW.DIGITALBLASPHEMY.COM
HTTP://WWW.COOLHUNKS.COM
/HTTP://WWW.GEOCITIES.COM/PHOTOCITY1
HTTP://WWW.CRESTONBC.COM/BACKGROUNDS
/HTTP://WWW.PHOTO.NET/GALLERY
/HTTP://NSSDC.GSFC.NASA.GOV/PHOTO_GALLERY
HTTP://WWW.PHOTOMANN.COM/TURKEY/INDEX.HTM
/HTTP://WWW.PHOTOCRITIQUE.NET
/HTTP://WWW.STEEHOUWER.COM
HTTP://WWW.THKPHOTO.COM/FS_GALLERY

# ڤایرۆسەکانی مۆبایل

**شاناز حسن**

تا ئێستا مەترسیمان لە ڤایرۆسەکانی کۆمپیوتەر بوو رۆژانەش بەچەندان ڤایرۆسیان دەناساندین، ئەمجارەشیان با بەیەکەوە ڤایرۆسەکانی مۆبایل بناسین بزانی چ جۆرێک و چ مەترسیەکیان هەیە، ئەوەی شایەنی باسە لەسەرەتادا ڤایرۆسەکان تەنها توشی ئەم مۆبایلانە دەبون کە بەرنامەکانیان سیستەمێکی لە شێوەی سیستەمی ویندۆزیان تێدابووەو زۆر بەئاسانی توشی ڤایرۆس دەبون بەلام ئێستا زۆربەی هەرەزۆری مۆبایلەکان ئەم سیستەمەیان تێدایە واتە لەشێوەی کۆنترۆل پەنەل یان لابردن و دانانی بەرنامەکانەو بەرێوەبردن و دەست کاریکردنی بەرنامەکان . هەر ئەم هۆیەشە کە ئێستا ڤایرۆسی مۆبایلی زیادیان کردوەو توشی مۆبایلەکان دەبن . بروانە جۆرەکانی ڤایرۆسی مۆبایل :

١- CABIR لەم ڤایرۆسە دوو جۆر هەن، بریتین لە EPCC/CABIR لەگەل SYMBOS/CABIR وە ئەم ڤایرۆسانە دەگوازرێنەوە لەرێگای بلوتوسەوە لە ئامێری سامبیۆن وە ئەو کەسەی ئەم فایلە بە ڤایرۆسەی بۆ دەچێت لەشێوەو ناوی CARIBE.SIS دەبینێت و یەکسەر دەچێتە INDEX دوای کلیک کردنی دەکرێتەوەو بەناو ئامێرەکەدا بلاودەبێتەوەو دەگوازرێتەوە بۆ مۆبایلی تر هەر لەرێگای بلوتوسەوە .بۆ یەکەم جار کۆمپانیای کاسپەر سکای ئەم ڤایرۆسەیان دۆزیەوە.

٢- METAL GEAR ئەم ڤایرۆسە لەلایەن کۆمپانیای SIMWORK دۆزرایەوە زیان دەگەینێت بە سیستەمی بەرگری و بەرنامەکانی هەلدانەوەی پەرەکانی وێب لە مۆبایل ناوی ئەم ڤایرۆسە لەناوی یاریەکی مۆبایلەوە هاتوە کە لە بنەڕەتدا ئەم یاریە بێ ڤایرۆس و پاکە بەلام ئەم ڤایرۆسە ئەم ناوە بەکاردەهێنێت بۆ زوو بلاوبونەوەی،وە ئەم ڤایرۆسە هەلدەستێت بەبلاوکردنەوەی ڤایرۆسی تر بەناوی SEXXXY. SIS کە دەبێتە هۆی وەستاندنی دوگمەکانی مۆبایلەکەت.

٣-LASCO A ئەم ڤایرۆسە لەبەرازیل دروست کراوە لەرێگای بلوتوس یان هاوپێچ بوونی لەگەل بەرنامەکانی تر دەخزێتە ناو مۆبایلەکانەوە

٤- SKULLS ئەم ڤایرۆسە جیایە لەمانەی تر ئەم تەنها توشی موبایلی نۆکیای ٧٦١٠ دەبێت بەلام پێویستە ئەوانی تریش بەئاگا بن وە دەگوازرێتەوە لەرێگای کۆمپیوتەرەوە کاتێک مۆبایلەکەت پێوەبەستراوەتەوە، لەسەرەتادا کاری (NOKIA THEME MANGER) رادەگرێ دواتر هەموو وێنەو فایلەکان دەکاتە جم جمە ی ئێسک پاشان سیستەمی تەلەفۆن کردن تێک دەدات لەکۆتایی تەنها دەتوانیت نامە وەرگریت یان وەلامی تەلەفۆن بدەیتەوە، نەوەی نوێ لەم ڤایرۆسە ناوی SKULLSB کە لەرێگای بلوتوسەوە دەگوازرێتەوە .

لەکۆتایدا ماوە بلێم کەئێستا زۆربەی کۆمپانیاکانی دروست کردنی ئامێری مۆبایل لە هەولی دروست کردنی باشترین بەرنامەی پاراستن و پارێزگاری کردن و خۆپارێزی ڤایرۆسەکان دەکەن.

# مانای ئەو ژمارانەی کە لەکاتی بوونی هەڵە لە پەیوەندی کردن بە ئەنتەرنێتەوە دەردەکەون

زنجیرەی (١)

حسن عمر حسن



خزمەت گوزاری ئەنتەرنێت زۆر بەخێرایی و نرخێکی گونجاو گەیشتە ناو زۆربەی ماڵەکان لەکوردستاندا ئەمەش جێگای خۆشحاڵیە کە ئەم دامەزراوە پڕ خزمەتە چەند پێشوازی لێدەکرێت لەم ماوە کورتەی داهێنانیدا ئاوا لەناو کوردستان پەرە دەسێنێت . ئالیەت و ڕێگاکانی گەیاندنی ئەم خزمەت گوزاریە زۆرن بەڵام ئەوەی ئێستا لەکوردستان زۆر باوە بریتیە لە گەیاندنی ئەنتەرنێت بۆ ناو ماڵان لەرێگای تەلەفۆنەوە کە لەکاتی بەستن و پەیوەندی کردن بە ئەنتەرنێتەوە ئەگەر هەڵەیەک لەم سیستەمە هەبوو ئەوا بۆکسێک دێت بە ژمارە دەست نیشانی ئەم هەڵەیە دەکات بۆ ئەوەی ئێمەش بزانین ئەم ژمارەیە مانای چی دەبەخشێت لە ژمارەکانی گۆڤاری کومپیوتەر تەواوی ئەم ژمارانە ڕون دەکەینەوە کەزیاتر لە (٢٠٠) ژمارە دەبن هەرجارەو هەندێکیان ڕون دەکەینەوە ئەم ژمارانە لە ٦٠٠ دەست پێدەکەن و لە ٨٠٠ کۆتاییان پێدێت بۆ ئەمرۆی بەکارهێنەرانی کومپیوتەرو ئەنتەرنێت گرنگن چونکە لەدوای تێگەیشتن لە ماناو ئاماژەکەی یەکسەر دەتوانیت هەڵەکە یان کێشەکە چارەسەر بکەین .

١- ٦٠٠ هەڵپەساردنی پرۆسەکە (گەران و لێکۆلینەوە بەناو پێکهاتەکانی توری پەیوەندی ).
٢- ٦٠١ هەڵە لە جێبەجێکاری پەیوەندیەکە هەیە.
٣- ٦٠٢ جێبەجێکاری گەیاندنی پەیوەندی کراوەتەوەو کاردەکات (واتە پەیوەندی کراوەتەوە بەڵام بەخەتی ئەنتەرنێت نا بەڵکو فاکس یان خزمەت گوزاری تر بۆ ئەنتەرنێت پەیوەندیەکانی تر بپچرێنە .
٤- ٦٠٣ بواری پەیوەندی کردن زۆر بچووکە.
٥- ٦٠٤ زانیاریە گرنگ و بنەڕەتیەکان هەڵەن.
٦- ٦٠٥ ناتوانیت دەست نیشانی زانیاریە بنەڕەتیەکان بکەیت.
٧- ٦٠٦ ناتوانیت لەم جێبەجێکارەی تورەکەتەوە پەیوەندی بکەیت.
٨- ٦٠٧ پشکنینی تەواوی هێڵەکە بکە چونکە چالاک نیە.
٩- ٦٠٨ دەست نیشانی ئامێرەکەت بکە چونکە نەناسراوە.
١٠- ٦٠٩ جۆری ئامێرەکەت نەناسراوە.
١١- ٦١٠ دەست نیشانی بواری پەیوەندی بکە چونکە ناچالاکە.
١٢- ٦١١ نێرەری تورەکەت هیچ وەلامی نیە.
١٣- ٦١٢ دەست نیشانی نێرەری نا تایبەتمەند بکە (گرنگ نیە).
١٤- ٦١٣ گرنگ نیە.
١٥- ٦١٤ هیچ بوارێکی پێویست بۆ پەیوەندی نیە.
١٦- ٦١٥ نەیتوانی جێبەجێکاری پەیوەندی یەکە بدۆزێتەوە.
١٧- ٦١٦ داوکاریەکەی تۆ بەردەست نیە.
١٨- ٦١٧ لە پێشدا پەیوەندی مۆدێم پچراوە.
١٩- ٦١٨ جێبەجێکاری پەیوەندی کردنت نەکراوەتەوە.
٢٠- ٦١٩ جێبەجێکاری توری ئەنتەرنێت پەیوەست نەبووە.
٢١- ٦٢٠ تا ٦٢٧ گرنگ نین.
٢٢- ٦٢٨ کۆتایی بە پەیوەندیەکە هات.
٢٣- ٦٢٩ پەیوەندیەکەت پچرا لەلایەن کومپیوتەرەکەوە.
٢٤- ٦٣٠ پەیوەندی مۆدێم پچرا بەهۆی فەشەلی ئامێرەکەتەوە.

# ئەگەر ئیمێڵەکەت دزرا چۆن جارێکی تر دەیگەڕێنیتەوە بەشێوەیەکی زۆر ئاسان




وێنەی (١)

ئا ئەڤین ضیاءالدین

بەڕێزان ئەم بابەتە زۆر گرنگە لەبەرئەوەی هەموومان دەزانین ئەنتەرنێت هاک کردن و ئیمێڵ دزین و پاسوەرد دزین کردارێکی زۆر سانایە زۆرکەس دەتوانی بەهۆی ناردنی وێنەیەک یاخود ناردنی ئیمێڵێک ئیمێڵەکەی تۆ هاک بکات بۆ خۆی تۆش لەکاتی کردنەوەی ئەو شتە نازانی چیەو لەکوێوەهاتوە مەبەستی چیە بەم شێوەیە ئیمێڵەکەت لەدەست دەدەیت . بەڕێزان بۆ هێنانەوەی ئەم ئیمێڵە یەکەمجار سایتی ئیمێڵەکان بکەوە ئینجا لەو جێگایەی 1NAME و 2NAME نووسراوە وەک لەوێنە (١) دا دیارە تۆ لەم دووجێگایە ناوی ئیمێڵەکەت بنوسە بەلام هۆتمێل یاخود یاهوو مەنوسە ئینجا لیستێک دیاردەکەوێت ئینتەر دابگرە لیستێکی تردێت CONTINUE دابگرە بەم شێوەیە وێنە ٢ لێرەدا تۆکارت تەواودەبێت ئینجا بڕۆ ئیمێڵەکەت بکەوە نووسینێک دێت ئەم نووسینەیە TO RESET YOUR PASSWORD. CLICK THIS LINK TO CREATE YOUR NEW PASSWORD AT THE .NET PASSPORT WEB SITE: دایبگرە بەماوس پاسوێردەکەت دەداتێ.

Sign In .net

**Please type in your new password**

To finish resetting your password, please type a new password and then click **Continue**.

**E-mail Address** *barcfarca@hotmail.com*

**Password**

six-character minimum; no spaces

**Retype Password**

**Continue**

Microsoft .net

Member Services Terms of Use Privacy Statement

Some elements © 1999 - 2003 Microsoft® Corporation. All rights reserved.

وێنەی (٢)

# هەنگاوەکانی دروست کردنی پەیوەندی بە تۆڕی ئەنتەرنێتەوە




وێنەی (١)

شاخوان
shakhawano@yahoo.com

کاتێک کۆمپیوتەرەکەت فۆرمات کردوە یان بە هۆی ڤایرۆسەوە ئەم بەرنامەیەت لەدەست چوە یان ئەوەتا بە هەڵەیەک نەماوە، ئەوا بۆ گەڕاندنەوەی ئەم بەرنامەیە پێویستت بە لێزانی بەرنامەی تۆربەندیە ئەگەرنا گەیاندنیەتی بۆ بازارو گەڕاندنەوەی بۆماڵەوە یان شوێنی کار

ئەم کارەش بۆ ئەو کەسانەی لە سەر تۆڕی ئەنتەرنێت کاردەکەن ئەستەم و گرانە ئێستا ئێمە لەڕێگای گۆڤاری کۆمپیوتەر بەئاسانترین ڕێگە ڕونی دەکەینەوە ئەم هەنگاوانە زیاتر ئەو شێوازە دەگرێتەوە کە پەیوەندیکردن بە ئەنتەرنێت لەڕێگای تەلەفۆنی نۆرماڵە دەبێت کاتێک دەتەوێت لەڕێگای تەلەفۆنی نۆرماڵەوە پەیوەندی بە ئەنتەرنێت بکەیت پێویستت بە کۆمەڵێک هەنگاو دەبێت، تاکو ناساندنێک لەنێوان مۆدێمی

خۆت و تەلەفۆنەکە دروست بکەیت و لە بەرەنجامی ئەم ناساندنە ئەگەیتە تۆڕی ئەنتەرنێت بۆ ئەم کردارەش بەشێوەیەکی گشتی لەم هەنگاوانە دەست پێدەکەین:
لەسەرەتادا دەچینە کۆنترۆڵ پەنەڵەوە دوایی یەکسەر دەچینە (NETWORK CONNECTIONS) دوو کلیکی لەسەر دەکەین و دەچینە ناو ئەم بەشە نوێیە ،بڕوانە وێنەی (١) پاشان لە لای چەپدا لەژێر (NETWORK TASKS) کە لە وێنەی (٢) ئاماژەی پێکراوە.

(CREATE A NEW CONNECTIONS) هەڵدەبژێرین و کلیکێک لەسەری دەکەین. پاشـــان دەبینین بۆکســێک دێت یەکسەر (NEXT) دەکەیـــن . لـــەدوای ئەم هەنگاوە بۆکســێکی تــر دێت هەڵبــژاردەی یەکەم دەســت نیشـــان دەکەین وەک لە وێنەی (٣) دیارە نوسراوە (CONNECT TO THE INTERNET) پاشـــان (NEXT) دەکەیـــن، لەدوایدا بۆکســێکی تر دێت ئەمجارەیان هەڵبژاردەی دووەم دەست نیشان دەکەین (SET UP MY CONNECTION MANUALLY) پاشـــان (NEXT) دەکەین بۆ رونکردنەوە بڕوانــە وێنەی (٤) لەدوایــدا بۆ ئەمجارە هەڵبژاردەی یەکەم دەست نیشانت دەکەین کە نوسراوە (CONNECT USING A DIAL – UP MODEM) یەکسەر (NEXT) دەکەین بڕوانە وێنەی (٥) لە دوای ئەم هەنگاوانە دێینە ســەر پڕکردنەوەی زانیاریەکان و پێدانی زانیاری پێویســت بەم سیســتەمە



وێنەی (٢)

وێنەی (٣)



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)

بـۆ تەواوکردنـی هەنـگاوەکان وەک لەوێنـەی (٦) دیارە لەم بۆشـاییە ناوێک دەنوسـین بە ئـارەزوی خۆمـان، دوایی (NEXT) دەکەین ئینجا لەشـوێنی ژمارەی تەلەفۆن (#777) دەنوسین یان بەگوێرەی داواکاری کۆمپانیـای دابینکردنـی هێڵی ئەنتەرنێت بڕوانە وێنەی (٧) ئەمجارەیان لـەم بۆکسـە ئـەو زانیاریـە تایبەتانـە (user name& passward) دەنوسـین کـە کۆمپانیاکە پێمان دەدات پاشـان (NEXT) وەک لەوێنەی (٨) رونکراوەتەوە پاشـان (NEXT) دەکەیـن ئینجـا لەکۆتاییدا ئەگەر ئارەزومانە لەسەر دیسک تۆپ دەرکەوێت دەست نیشان دەکەین و پاشان (FINISH) کلیـک دەکەیـن و دەتوانیـن بەبەسـتنی کیبلـی تایبەت پەیوەنـدی بکەین. بڕوانە وێنـەی (٩ ) کە دوا هەنگاوەو گەیشـتنە کۆتایـی هەنگاوەکان و بۆ هەموو کاتێکی پەیوەندی ئەم بۆکسەمان بۆ دێت .



وێنەی (٦)



وێنەی (٧)



وێنەی (٨)



وێنەی (٩)

# خزمەت گوزاریەکی گەورە بۆ تەماشەکەرانی زنجیرە فلیمەکان لەڕێگەی ئەنتەرنێتەوە




## ڕەنجبەر

ئەنتەرنێت خزمەت گوزاریەکی گەورەیە بۆ مرۆڤ لە هەمــوو بوارێکداو هەردەم لــە بــەرەو پێــش چــون دایە بۆ ســوود وەرگرتنــی مــرۆڤ و بەدەســت هێنانی ئامانجەکانیــان، بەلام مــەرج نیە هەموو کەسێک بۆ سود وەر گرتنی خۆی کارێک ئەنجامدا بەلکو زۆرن ئەو کەســانەی بۆ خزمەت و ســوود وەرگرتنی کەسانی تر بەرنامەیەک یان کارێک ئەنجام دەدەن.

ئەوەتــا کۆمپانیــای WARHEY خــۆی ئامــادە دەکات بــۆ خزمــەت گوزاریەکی گــەورە لە ســەر تــۆری ئەنتــەر نێت بۆ نیشاندانی زنجیرە فلیمەکان بە شێوەیەک کــە بەخۆڕاییــە بــۆ ئــەو کەســانەی کە ســەیری زنجیــرە فلیمــەکان دەکەن،ئەم خزمەتگوزاریەش بە INSTV دەناسرێت،و بــە ریکلام پالپشــتی دەکرێت ولەســالی یەکەم نزیکەی ٤٨٠٠ زنجیرە تەلەفزیۆنی بلاودەکاتــەوە،وە ئەم خزمــەت گوزاریە سود بە کۆمپانیا گەورەکان دەگەیەنێت لە ڕێگەی بلاو کردنەوەی ریکلامەکانیان لە هەر نیو کاتژمێرێکی زنجیرە فلیمەکانی.

کۆمپانیــای AMERICAN ONLINE بــەو هیوایەیــە پەخشــی ڤیدیۆیــی لــە رێگای ئەنتەرنێتــدا فراوان بــکات وە ڕێگەش بە بینــەران دەدات لە ڕێگــەی ئینتەرنێتەوە فلیمــی ڤیدیۆیــان دەســت بکەوێــت وە ئــەم کۆمپانیایــە بــوار بــە دەر هێنەرو ســینەماکاران دەدات تــا ســودێکی لێوەرگــرن وە ســود لە دەرهێنــەران و بەهرەمەندانــی جیهــان وەر بگــرن. بەو هیوایەی کە دەرهێنەرانی ئێمەش ســوود لــەم کۆمپانیایــە وەر بگــرن و بتوانــن شــوێنی خۆیــان لــەم مالپــەڕە بکەنەوە تاکو بەرهەمەکانیان تیادا بلاوبکرێتەوەو هیــوادارم خوێنەرانیــش ســودی لــی وەربگرن.

سەرچاوە: الشرق الاوسط

# فلاش میمۆریەکی 100 MB بەخۆڕایی

ڕەنجبەر نەجات
Ranjbar_1988@yahoo.com

ئێمە زۆر جار پێویستیمان بە فلاش میمۆری یان دیسک یان سیدی یاخود هەر شتێکی تر دەبێ تاکو بەرنامەکانمان یاخود وێنەو یا هەر شتێک کە پێویستمان پێی بێت لە سەری خەزن بکەین بۆ ئەوەی لە کاتی پێویست بەکاری بهێنین یانیش بۆ پاراستن و لە دەست نەچونی بەرنامەو وێنەکان بەکاری دەهێنین، بەلام لەگەڵ بەرەو پێش چونی ئەنتەرنێت و بەردەوامی خزمەت گوزاری نوێ ئەمەش وای لە هەندێ کۆمپانیای تایبەت بە خزمەت گوزاری ئینتەرنێت کرد کە بەرنامەیێک دابنێن لەسەر تۆری ئینتەرنێت بۆ هەلگرتنی بەرنامەو فایلەکانمان بەشێوەیەکی بەخۆرایی تا ئەوکاتەی کە پێویستمان پی بێت بەشێوەیەکی گشتی واتا سایتێک لەسەر شێوەی فلاش میمۆری بۆ ئەوەی فایلەکانمان لەسەر خەزن بکەین و ناوێک و پاسوێردێکی بۆ دادەنێین وە لە هەر کاتێک پێویستمان بەم فایلە هەبێت ئەوا ئەم سایتە دەکەینەوەو ناو و پاسوێردەکەمان دەنوسین فایلەکانمان بۆ دەکرێتەوە وە فایلەکەت بەشێوەیەکی پارێزراوە تا هەر کاتێک کە بتەوێت، وە نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە ئەم سایتە چێگای نزیکەی ١٠٠ MB دەبێتەوە بۆیە تۆ دەتوانیت زۆر بە ئاسانی هەر فایلێکت بوێت خەزنی بکەیت، بۆیە من پێم وایە ئێمە زۆر پێویستیمان بەم سایتە هەیە، بۆیە من بە پێویستم زانی ئەم سایتە بلاو بکەمەوە بۆ ئەوەی هەموومان سوودی لێوەربگرین،بەم شێوەیەی خوارەوە دەتوانن بەکاری بهێنن.

سەرەتا بچۆ ئەم سایتە بکەوە WWW.4SHARED.COM (وێنە١)

پاش ئەوەی سایتەکەت کردەوە کلیک لەسەر SIGNING UP بکە بۆ خۆ تۆمار کردن پاشان ئەم بەشەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە. (وێنە٢)

پاش ئەوەی ئەم بەشەت بۆ کرایەوە ئەم هەنگاوانە جی بە جی بکە لە بۆشایی یەکەم ئیمەڵەکەت بنوسە لە دوای ئەمە




وێنەی (١)

Create your FREE 4shared account. It's not a TRIAL, it's FREE!

e-mail: ئیمایلەکەت بنوسە

password: پاسوردێك بنوسە

confirm password: پاسوردەکەت دووبارە بنوسە

REGISTER

By signing in you accept our Terms of Use

وێنەی (٢)

لە بۆشـایی دووەم پاسوێردێک بنووسە وە لە بۆشـایی سـێ یەم پاسوێردەکەت دووبـارە بنووسـەوە لـەدووای ئـەم کردارانە کلیک لە سـەر REGISTER بکە بـۆ ئـەوەی هەنگاوێکی تر بـەرەو پێش بچیـن و ئـەم بەشـەی خوارەوەمان بۆ بکرێتەوە، (وێنە٣)

بـۆ ئـەوەی فایلەکانمـان بخەینە ناو سـایتەکە کلیک لەسـەرBROWSE بکەو پاشان کلیک لەسـەرUPLOAD بکە دوای ئەمە فایلەکانمان دەچێتە بەشی سەرەوە، وە نابێت قەبارەی یەک فایل گەورەتربێت لە10 MB .

وە هەر کاتێک پێویستیت بە فایلەکانت بـوو ئـەوا فایلەکە دیـاری بکـەو کلیک لەسەر بەشی دابەزاندن بکە.

Thumbnails | Purchase | My Account | Activate

| Select | Name | Size | Type | Time |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| | AMUSTRegCleaner.rar | 1,020 KB | File | 2005-11-21 |

قەبارەو ناوی ئەو فایلەی کە ئەپلۆدت کردووە

دابەزاندن

قەبارەی یەك فایل نابێت گەورەتر بێت لە 10 MB

Upload files
Upload files to current folder
1 Bla igennem...
2 Upload
+More

Used space: 1 044 040 bytes 0 MB
Free space: 103 813 560 bytes 99 MB
Capacity: 104 857 600 bytes 100 MB

وێنەی (٣)



# ئەگەر کامیرای دیجیتاڵ بەکاردێنی ئاگادار بە!!

نبیل ع. فتاح

خوشک و برای بەڕێز زۆربەی خەڵکی ئەمڕۆ بێگومان کامیرای فۆتۆی یان ڤیدیۆی دیجیتاڵ بەکاردێنی، ئەگەر کامیراش نەبێ ئەوا مۆبایلی پێشکەوتوو کەوا زۆر بەئاسانی دەتوانی وێنەی فۆتۆیی و ڤیدیۆیی بەمەرجێک ئەگەر هاتوو میمۆری کارتی بەکاربێنی.

ئاگادار بە ئەو وێنەیەی خەزنی دەکەیت کاتێک دەیسڕیتەوە دەتوانرێت جارێکی تر بگەڕێتەوە بەهۆی بەرنامەی کۆمپیوتەری وەک RECOVER MY FILE و FINAL DATA یان بەرنامەی تر لەم بارەوە، بۆ یە ئاگادار بە ئەگەر وێنەی خێزانی هەبوو لە کامیراکە ئەوا بزانە فرۆشتنی کامیراکە بۆ جۆرە کەسانێک کەوا گومانی خراپ لە دڵیان دایە دەتوانن بەم جۆرە بەرنامانە وێنەکان دووبارە بگەڕیننەوە.

کاتێک ئەم جۆرە ئامێرانە دەکڕی، هەوڵیش بدە نەیفرۆشی تاوەکو لای خۆت بێ کەڵک دەبێت و بیشکێنی ئینجا فرێیبدە.

# تازەترین تەکنەلۆجیا لەکۆمپانیای (ایزرای) وە ArcGIS Explorer



ئا: ڕێدار شێرزاد

بەم دواییە کۆمپانیای ایزرای ESRI بەرهەمێکی زۆربەسودی ڕاگەیاند کەلەمانگی داهاتوو دەکەوێتە بازارەکانەوە ئەویش بەرنامەی (ARCGIS EXPLORER)ـە کەلە بواری جوگرافیاو دیاری کردنی جیهانە بەشێوەی 3DIMITION واتا تۆ دەتەوێ بینایەک دروست بکەیک یاخود خانوێک ئەنجام بدەیت دەتوانی زۆر سود لەم بەرنامەیە وەربگریت بەشێوەیەک پێویست بە وەناکات تۆ سەرەتا تاقیکردنەوە لەسەر شوێنەکە بکەیت یان چەند ئەندازیارێک بینیت بە بەرنامە باڵەخانەکەت بۆدروست بکەن، ئەم بەرنامە لەئەنتەرنێت دەکەیتەوە هەموو ڕووبەری جیهان لەناو ئەوبەرنامەیە هەیە وەکو گوگل ئێرث بەلام گرنگی ئەوبەرنامە سیلای جیهانت پێنیشان دەدات کەچی گوگل ئێرث تەنها یەک لای جیهانت پێنیشان دەدات.



# بۆ خاوه‌ن مۆبایله‌كان

شانۆ كاروان/ سلێمانی

دوای ئـه‌وه‌ی مۆبایـل بـوو بـه پێویسـتیه‌كی ڕۆژانـه‌ی خه‌ڵـك وای لێهات كار ئاسـانی ژیانـی خه‌ڵكی بكات تا ئه‌و راده‌ی خه‌ڵك به‌گشـتی و هه‌موو فه‌رمانبه‌رو كه‌سـانی ئاسـایی و كاسب كارو ناكاسـب مۆبایـل هه‌ڵبگرن، له‌گه‌ڵ ئه‌م هه‌مـوو بڵاوبونه‌وانه‌ش مه‌سـه‌له‌ی ون بون و دزین و له‌ناوچون و سوتانی مۆبایله‌كان و سـیمكارته‌كان دێته گۆڕێ واتـه له‌گـه‌ڵ بڵاوبونه‌وه‌ی شـته گرنگ و په‌یوه‌ندیداره‌كانـی ژیانـی خه‌ڵـك هه‌ندێك گرفـت زیاد ده‌كه‌ن وه‌ك دزینی مۆبایـل، جـا بۆ ئـه‌وه‌ی ئـه‌م گرفته به قازانج نه‌شـكێته‌وه بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه مۆبایلیان ده‌ست ده‌كه‌وێت به‌شێوه‌یه‌كی نایاسـایی جا دزین بێت یـان دوزینه‌وه بێت بۆ ئه‌وه‌ی سیمكارته‌كه‌مان له‌ده‌ست نه‌چێـت و ببینـه‌وه خاوه‌نـی هه‌مـان سـیمكارت پێویسـته زنجیره‌ی ژماره‌ی مۆبایله‌كه‌مـان بزانین بۆ ئـه‌وه‌ی له‌هه‌ر حاڵه‌تێك كه له‌سـه‌ره‌وه باسـم كرد ئه‌وا یه‌كسـه‌ر په‌یوه‌ندی بكه‌یت به كۆمپانیای تایبه‌ت به خزمه‌تگوزاری مۆبایله‌كه‌ته‌وه بـۆ راگرتنـی ئـه‌م ژماره‌یـه تا ده‌سـت كه‌وتنـه‌وه‌ی، بـۆ ئـه‌وه‌ی كۆمپانیـا ئه‌م ژماره‌یه بخاته لیسـتی ره‌شه‌وه و كه‌س نه‌توانێت په‌یوه‌ندی به‌و ژماره‌وه بۆ هیچ شـوێنێك بكات تـا ده‌گه‌ڕێته‌وه ده‌سـت خاوه‌نه‌كـه‌ی. جا بۆ ئه‌وه‌ی له‌مه‌ترسـی ونبونـی زنجیـره ژمـاره‌ی مۆبایله‌كه‌ت دور كه‌وێتـه‌وه ئـه‌وا ژماره‌كه له سـه‌ر پارچـه كاغه‌زێك بنوسـه‌و له‌شـوێنێكی باش هه‌ڵیگـره‌وه بیپارێزه، وه بۆ زانینی ژمـاره‌ی مۆبایله‌كـه‌ت ئـه‌م هه‌نگاوانـه په‌یـڕه‌و بكه‌و په‌نجه بنی بـه‌م ژمارانه‌ی خوار‌ه‌وه :

له‌سه‌ره‌تادا په‌نجه بنی به ( * دواتر # پاشان ژماره سفر پاشان ژماره ٦ پاشان # ) ده‌بینین ژماره‌یه‌ك ده‌رده‌كه‌وێت كه له پانزه ژماره پێك هاتووه و ئه‌مه ژماره‌ی تایبه‌ت بـه مۆبایله‌كه‌ته، جا له‌كاتی دزین یـان ونبون له‌گه‌ڵ په‌یوه‌نـدی كردنت به كومانیـان په‌یوه‌ندیه‌كانـی مۆبایـل ئه‌م ژمـاره‌ی ده‌ده‌یتـی ئه‌ویـش ده‌توانێـت سیمكارته‌كه‌ت رابگرێت.



# چاودێریکردنی ئاسمانی باڵندەی فلامانجۆ

ئا : گۆران

وولاتەکانی عەرەبی ئیمارات بەم دواییە بەمەستی دیاری کردنی باڵندەی فلامانجو کە کوچکردن و هاتنەوەیان بەرەو کویندەرە هەستا بەدروستکردنی ئامیری دیاریکردن ئەویش وەکو توقیکە کەکردویەملی چەند باڵندەیەک لەو باڵندانە ئەوانیش بەهوی تیکەل بوونیان لەگەل ئەم جورە باڵندانەی کەلەتوخمی خویانن شوینیان بەردەوام دیار دەبیت و بزریش نابن هەروەها جورەکانیشیان لەگەل ئەوانەی کە زور لەیەک دەچن بەئاسانی لیک جیادەکریتەوە.

# تەختەی کیبۆرد بەڵام بێدووگمە DOMES

ئا : هاوکار عبدالقادر




وەک هەمووومان دەزانین کە تەکنەلۆجیا هەر لەپێشکەوتن دایە بەتایبەتی کۆمپیوتەر لەپێشەوەی هەموویان بەجۆرێک کەبوەتە هۆی بەرەوپێشبردنی زۆربەی زۆری ئەو ئامێرە پێشکەوتوانەی کە ئەمڕۆ لەبەردەستمانن بێگومان ئەگەر کۆمپیوتەر خۆی تاکە تەکنەلۆجیابێت لەم بوارە پێشکەوتوە دەبێت پێشکەوتن لەخۆیدا چۆن بێت ئائەوەتا لەدواپێشکەوتنەکانی بوارەکانی خۆیدا کیبۆردی بێدووگمەیKEYBOARD ORBITOUCH KELESS ی هێنا ئاراوە کەقەبارەیەکی زۆر بچووکی هەیە لەچاو کیبۆردی پێشوو هەروەها توانایەکی زۆربەرزی هەیە ئەم کیبۆردە وەک لەوێنە (١) دادیارە دوو بزوێنەری هەیە هەربەهۆی ئەمانەوە دەتوانی هەموو کارەکانی کیبۆردی پێبکەیت و هەروەها کاری ماوسیش ئەنجام دەدات ئەگەر بێت و دەستت لەسەری لێرابێت وە زۆر خێرا نووسین ئەنجام دەدات ئەم کیبۆردە پێشکەوتوە بەم زووانە دەکەوێتە بازاڕەکانەوە وە ئەگەر کڕیارو خوازیاری زۆربێت ئەم کیبۆردەش توانای هەیە نرخی بگاتە ٧٠٠ دۆلار بۆ زانیاری زیاتر پەیوەندی بەم سایتە بکە:

/HTTP://WWW.KEBOWL.COM

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەردا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM
EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

*هەر بابەتێک بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .
* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بڵاوکرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە.
* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بڵاوکردنەوە ئەوا ناگەڕێتەوە.
*هەر کەسێک بابەت ئەنێری بۆ بڵاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسک یان فلاش میموری بێت و وێنەی ڕوونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.

# مەترسی بەکارهێنانی بلوتوس لە شوێنە قەرەباڵغەکان




شیبا محمد

لەژمارەکانی پێشودا بابەتێک لەژێر ناوی بلوتوس بڵاو کرایەوە منیش حەزمکرد ئەم جارەیان بابەتێک لەسەر بەکارهێنانی بلوتوس بنوسم، گومان لەوەدا نیە هەموو ئەم پێشکەوتن و پەرەسەندنانەی بوارە جیاجیا کان بۆ خزمەت کردنی مرۆڤایەتی و خزمەت کردنی مرۆڤە بەلام لەهەمان کاتدا زۆرجار ئەم خزمەت گوزاریانە ئەگەر بەشێوەیەکی دروست بەکار نێن زیان دەگەینن یان ئەوتا کەسانێک ئەیانەوێ روی ئەم خزمەتگوزاریانە ناشیرین بکەن ئەویش بە نیشاندانی رویەکی ناشیرینی ئامرازەکان یا خراپ و نادروست بەکارهێنانی. سەبارەت بە بلوتوس زۆر خزمەت گوزاریەکی بەسودە لە گۆڕینەوەی زانیاریەکان لەنێوان مۆبایلەکان، بەلام من رێنمایی ئەو کەسانە دەکەم کە ئەم جۆرە ئامێرانەیان هەیە کە خزمەت گوزاری بلوتوسیان هەیە کە لە شوێنی قەرباڵغ و پڕ لە خەڵک بلوتوسەکانیان نەکەنەوە بەتایبەتی لەناو مۆبایل فرۆشەکان، چونکە وەکو لە بابەتەکەی پێشو باس کراوە کە ئەم سیتەمە دەتوانێت لەیەک جار زانیاریەکان بۆ هەموو ئەم مۆبایلانە بنێرێ کە بلوتوسیان کراوەتەوە، بەمەش زۆر جار نامەو وێنەی وات بۆ دێت کە ناتوانیت بیان سڕیوەتەوە وە ئەم نامەو وێنانە لەلایەک کاریگەری دەبێت لەسەر خۆت چونکە زۆربەی ئەم وێنەو نامانە شتی نادروست و نابەجێن و لەگەڵ باری کۆمەلایەتی ناگونجێن، لەلایەکی تریشەوە مۆبایلەکەت بەم نامانە کەناتوانیت بیانسڕیتەوە گران و قورس دەکات، بەمەش ناتوانیت کارونامەو وێنەی بەئارەزوی خۆت لەناو مۆبایلەکەت خەزن بکەیت چونکە ئەم نامانە تەنها بەبەرنامەی کۆمپیوتەری دەسڕێنەوە. جگە لەمەش هەندێک لەم نامانە وا رێک خراون کە یەک وێنە یان نامەیەک لە چەند شوێنێک خەزن ببێت بەمەش ئەگەر لەشوێنێک سڕیتەوە لەشوێنێکی تر دەمێنێتەوە، سەر ئێشە تر لەمانەش ئێستا مەترسی ڤایرۆسەکانی مۆبایلیش بڵاوبۆتەوە بەمەش مەترسی لەناوچونی زانیاریە خەزن کراوەکانی تایبەت بەخۆت لەناو مۆبایلەکەت ئەکەوێتە مەترسی. بۆیە تاکو دەتوانیت بلوتوس لە ناو شوینە قەرەباڵغەکان نەکەیتەوە .

# مۆبایل لاب تۆپ

ئا: ئەسکەندەر قارەمان



بەم دواییە کۆمپانیای انتر ناشیونال ئامێرێکی مۆبایلی هێنا ئاراوە کەدەتوانی لەجیاتی کۆمپیوتەری تایبەتی واتا لاب تۆپ ئەم مۆبایلە بەکار بێنی بۆ کارپێکردنی ئەنتەرنێت ئەمەش لەبەر گلەیی زۆری خەلک لەئامێری لاب تۆپ هاتە ئاراوە لەبەر ئەوەی لاب تۆپ هەلگرتنی زۆر ئاسان نیە لەبەر قەبارەکەی واتا هەتا زانیاری لەپێشکەوتن دابێت منیش ئاسانکاریم دەوێ بەلێ بەم جۆرە ئەم شتە نایابە هاتە ئاراوە قەبارەکەی هەروەک مۆبایلی جارانە بەلام دەتوانی تەواوی ئەنتەرنێت لەناویدا بەکار بێنیت بەمەش سەرمایەی ئەم ئامێرە لەسالی ٢٠٠٥ گەیشتە ٢,٤ ملیۆن دۆلار بەمەش رکابەری ٢٠٠٠ کۆمپانیای زۆر بەهێز لەبواری کۆمپیوتەر ئێستا لە رکابەری دانە بۆداهێنانی پێشکەوتنی زیاتر لەهانۆڤەر.

# بەکارهێنانی مۆبایل لەناو فڕۆکە



ئا: کاروان سلێمان

بێگومان ئەگەر زانیاریمان هەبێت لەم بارەیەوە دەزانین کەنابێت مۆبایل لەناو فرۆکە لەناو ئەوپاسە ئەلیکترۆنیانە بەکاربێت کە تۆڕەکانی تەزوو لەجیاتی میکانیک لەناو ئەو ئامێرە بەکاردێت وەکو شەمەندەفەری میترۆ و فرۆکە بەتایبەتی لەبەرئەوەی کاردەکاتە سەر بزوێنەرەکانی ناوەوەی ئەوەش دەبێتە هۆی تێکچوونی باری ئەو فرۆکەیەو کەوتنی بەسەر زەوی بەلام بەهۆی پێشکەوتنی بەردەوام بەم دواییە زاناکان ئامێرێکی مۆبایلیان هێنا ئاراوە کە دەتوانی لەگەل خۆتا هەلی بگری بۆناو فرۆکە بێ ئەوەی کاربکاتە سەر تۆڕەکانی ناوەوەی ئەمەش زۆر گرنگە بەتایبەتی بۆ فرۆکەوانەکان و هەروەها بۆ ئەوانەی بەفرۆکە سەفەردەکەن.